


# فەلەکەدین کاکەیی

# بەرەنگی خۆی

## دوور لە سیاسەت

دیمانە: شێرزاد عەبدولڕەحمان



# بەڕەنگی خۆی دوور لە سیاسەت

دیمانەی

## فەلەکەدین کاکەیی

لەلایەن

شێرزاد عەبدولڕەحمان

کتێب: بەرەنگی خۆی دوور لە سیاسەت
دیمانەی: فەلەکەدین کاکەیی
ئەنجامدانی: شێرزاد عەبدولڕەحمان
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ۳۸۸
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە و بەرگ: ئاراس ئەکرەم
پیت لێدان: سوعاد عەبدولواحید
هەڵەگری: شێرزاد فەقی ئیسماعیل
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم، هەولێر- ۲۰۰۵
لە کتێبخانەی گشتیی لە هەولێر ژمارە (۳۸۸)ی ساڵی ۲۰۰۵ی دراوەتێ

فەلەکەدین کاکەیی، ئەو نووسەرو ڕۆشنبیرەی کە لە خۆشەویستی تواوەتەوە، ژیان لە گۆشە نیگای ئەو، دنیای نووسین و خەونە پاکەکانە، بێ نووسین ناژی، هەمــوو تەمەنی خۆی لەگەڵ وشەی جوان بردە سەر و قەڵەمی ڕەنگینی تەرخان بوو بۆ دەربڕینی جوانی داکۆکیکردن لە ژیان و سەروەریی مرۆڤ و ئاواتە بەدی نەهاتووەکان.

لە نووسینی کاکە فەلەک، شەفافیەت و راستگۆیی ڕوون دەردەکەوێ، عەشقی پیاوێک کە هۆگری ژیانە نەک بەپێوەری مانەوە و خۆڵقاندن بەژیانەوە، بەڵکو بەمانای سووتان لە دنیای وشە. کە زۆر شتی بەکاکە فــەلەک بەخــشی و زۆریشی لێ ســەندەوە. ئەوەی پێی بەخــشی، خۆشەویستی خەڵک و داکۆکیکردن بوو لە پاشەڕۆژ، ئەوەی لێی سەند تەمەنی خۆی بوو، ئەگەرچی ئەو چەند دێرە بەس نییە بۆ فەلەکەدین کاکەیی، بەڵام بەکورتی دەڵێم: یەکێکە لەوانەی ژیان جوانتر دەکات و نایەوێ مرۆڤ بێ خەون بژی.

* ئەم دیمانەیە بەچەند ئەڵقــەیەک لە ڕۆژنامــەی خــەبات بڵاوکراوەتەوە، بەڵام دوای وەرگرتنی بیروڕای کــاک فــەلەک، بەپەسەندمان زانی لە توێی کتێبێک کۆی بکەینەوە و بیخەینە بەر دەستی ئەو خوێنەرە هێژایانە کە خوازیاری بوونە. پرسیار لە ئێمەیە و وەڵام لە کاکەیە.

* فەلەکەدین کاکەیی کێیە؟

- زەڕەیەکی گەردی گەردوونە، لێرە نیشتووتەوە، بوو بەدڵێکی وزەی ژیان. زەڕەیەکی وردیلەی بەرۆکی گێتییە لە هیچەوە دیارنییە، جووتە لەگەڵ گشت گیانلەبەر و بوونەوەرەکانی دیکە، بەرێگای کاکێشاندا هەڵدەکشێ و دادەکشێتەوە، لەو ئوقیانووسە بێ سنوورەدا دەلەرێتەوە، بەرەو هەتاهەتایی وێڵ و سەرگەردانە، لەوێدایە و، لەوێ نییە، دیارە و نادیارە، نقومی ئەو ئوقیانووسە دەبێ.

* کە منداڵ بووی، بیرت لە چی دەکردەوە؟

- لە زۆر شت بیرم دەکردەوە، بەتایبەتیش چاوم لەفێربوون بوو، لە دەمە و بەیانی ژیانمەوە وەهام بەزەیندا دەهات کە هەرچیم بوێ لە ڕێگای خوێندن و زانینەوە پێی دەگەم.

هەرچەندە هێشتا ئایندەم، لە لا، لێڵ و تەماوی بوو، بەڵام لەو هزرەدا بووم کە ئەگەر (بەتەمەن) مەزن بم زۆرشت دەزانم و دەبێ بزانم. بڕیار وەهابوو.

* گەڕەگەکەتان لە کەرکووک چیت بیردەخاتەوە؟

- دەنگی منداڵێکی چاو قایم، بەیانیان دەیچریکاند: لەبلەبی!... لەبلەبی ...! لە دەرگاکان نەدەبووەوە مەگەر یەک یەک دراوسێیان، دەرچووبایین و لەو لەبلەبییە کوڵاوە گەرم و خۆشە هەندێکمان بکڕیبا. من لە گوند لەدایک بوومە و تا کۆتایی سەرەتایی لەوێ خوێندوومە، دواجار ئاشنای شاربوومە.

* لەبیرەوەری خۆتا، چۆن یادی دایکت دەکەیتەوە... ئەو چ مانایەکی هەبوو لەناختا؟

- برینی قووڵی منت کولاندنەوە، ئەو پەناگایەکی گەرم و میهرەبانی



لەڕاستەوە بۆ چەپ: باوکی فەلەکەدین ، برای فەلەکەدین، دایکی فەلەکەدین ... کە وێنەیەکی فەلەکەدین-ی بۆ یادگاری هەڵگرتووە، ساڵی ١٩٨٣.



فەلەکەدین کاکەیی لە هەرەتی لاویدا- ١٩٦٠ ئامادەیی کەرکووک

بوو. داخەکەم، وا ئەزانم بەخەم و ئۆفی دووری منەوە سەری نایەوە. ئەو کاتەی کۆچی دوایی دەکات من لە چیا دەبم، ئارەزووی (بەس) بینینێکی دیکەی من دەبێت. لەنێوانمانا دیواری ئەستوور و سامناکی ڕژێمی ستەمکار چەقیبوو، ئێستاش شەرمەزارم کە لەو دەمەدا، نەمتوانیوە خۆمی پیشان بدەم. من نەمزانی لەم دونیا دلڕەقە مالئاوایی کردووە. بەخەون و هەستێکی نادیار دەمزانی شتێک ڕوویداوە، دوای چەند مانگ، بەڕێککەوت، هەلاتووەک لە سەربازی، بۆی ئاشکرا کردم، ئەو کاتە لە (خڕێنە/ خنێرە) بووم، لە نێوانی لۆلان و خواکوڕک، ئێستاش شەرمەزاری ئەوم، واهەست دەکەم هێشتاش لە پشتی پەردەی نادیارییەوە چاوی لێمە، چاوەڕوانی نیگایەکمە... لێ من ناوێرم چاو هەلببڕم و تەمەشای بکەم، چونکە لە ئاستیا شەرمەزارم.

* دایکت، وەکو دایکی خەلکی دیکەبوو؟

– بەدیمەن و ڕوالەت وەکو خەلکی دیکەبوو، بەلام لەلای من چەترێکی سایەداری خۆشەویستی بوو. وامدەزانی تەنیا من خۆشم دەوێت، خوشک و برام هەنە، دەزانم کە پەناگای دلۆڤانی هەمووومان بوو، لێ ئەو وەهای کردبوو بەمن کە هەست بکەم تاکانەی ئەوم، نازانم ئایا پێوەندیی نێوانی هەر دایکێک و مندالەکەی وەهایە؟ نازانم... چونکە من تەنیا یەک جار ئەوەم تاقیکردۆتەوە، یەک جار دایکم هەبووە. ئێستا دەزانم کە هەموومانی خۆش دەویست، من لەودەمەدا خۆپەرست بووم، وامدەزانی بەس من هەم، دایکم هەموومانی خۆش دەویست، هەریەک لە ئێمە تاکانەی ئەوبووە.

* لە مندالی دەتزانی دەبی بەنووسەر؟

–دەتوانم بلێم کە لە خوێندنی سەرەتاییەوە خولیایەکی تەماوی وەهام هەبووە، نەمدەزانی هونەری نووسین چییە، لێ ئارەزووم بلند پەروازی بوو

لەبواری لەزەیندا، بۆچی؟! نازانم. دەمــویست بەبنجـۆی (بناغــەی) ئەم گەردوونە بگەم.

*** ئەو مامۆستایەی فێری کردی کێ بوو؟**

بابم. دروســتــترین: باپیــرانم لە ڕێگای بابمەوە، بەرلەوەی بمخــەنە بەرقـوتابخـانە، بابم فـێـرە نووسین و خـوێندنـی کردبووم بەشـیـعری گـۆرانی (هەورامی کـۆن) شانامەی ڕۆسـتـەمی زاڵ و زۆرابم دەخـوێندەوە، یەکـەمین کەس قەڵەمێک و دەفتـەرێکی بۆ هێنام نەنکم بوو، گـوتی: فـێربە بەدەرزی بیر هەڵکەنە (بەخۆی نەخوێندەواربوو). ئەویش بەر چوونە قوتابخانەم.

*** ئەی ئەوەی لێی دەترسای؟**

– باپیـرانم ... کە سەدان پرسیـار و ئەزموونیـان بۆ بەجێ هێشـتـووم.کەم پرسـیــارم وەڵام داوەتـەوە، لە کــەم ئەزمــووندا ســەرکــەوتووم. لە زۆربەی ئەزموونەکان دۆڕاوم، (مەبەستم ئەو کەلەپوورەیە کە لەسەر بنجی ڕواوم، هێشـتـاش بەتەواوی ڕەنگی نەداوەتەوە و، تێنەگەیشـتـووم. کەلەپوورەکەش ئەوەیە کە هەر بنیـادەمێک بەخـۆی بڕوا و، بگات، تێبگات). بۆ گەیشتن بە(ئەوێ) کەس دادی کەس نادات.

*** هـاوڕێـی کـۆنـت کـێ بوون؟**

– زۆربوون. بەگــشـتــی حــەزم لە هەڤــاڵ بەندی و دۆســتــایەتی بووە، بێـگومــان داب و نەریتی دۆســتــایەتی، لەگــەڵ زەمـان، گـۆڕاوە، ئەگــەر مەبەستت ناوهێنانی هەندێکیان بێت، ئەمانەم لەیادن:

شوکر، برادەری گیانی بەگیانی بووین، لە یەکەمی سەرەتایی لە گەڕانەوە لە قـوتابخـانەکەی گـوندەکـەی تەنیشـتـمـان بۆ گـوندەکـەی خـۆمـان، لەبەر دەسـرێـژو تەقــەی شــەڕە عــەشـایەری تـووشی (زاڵە تەرەکی) بوو، دوای ماوەیەک کۆچی دوایی کرد. ئەبەد لەیادم ناچێت.



فەلەکەدین کاکەیی ، دووەم کەس لە چەپەوە وەستاوە
ساڵی ١٩٥٥ قوتابخانەی توبزان-داقوق-کەرکووک



١٩٥٩ کەرکووک

لەیادی برادەرانی دیکەی منداڵیم وێنەیەکی کۆنی فۆتۆگرافی پێشکەشتان دەکەم (ناویان نووسراوە لەگەڵ چارەنووسیان)، دۆستانی دیکەم: یادگار، جوامێر کە مامۆستابوو لەم دواییە لە شاری سلێمانی کۆچی دوایی کردووە، کامیل هەروەها ماڵئاوایی لێکردووین، کیژۆڵەیەک (دۆستایەتی پاکی منداڵانەمان پێکەوەبوو، لێ ناوی نابەم، بمبوورن) و کەسانی تر... کە بەسایەی خواوە زۆرن.

* حەزت لە چی بوو؟

- لە منداڵیدا ئەوسا و ئێستاش حەزم لەوەیە، لەنیوە ڕۆژی بەر هەتاوی هاران، لە دەشتێکی سەوزەڵانیی گەرمیان، لەسەر کنێر وێخجە (بۆن و بەرامەیان بەدەماخما بچێ) بەگازەرای پشتەوە ڕابکشێم، بەهێمنی و بێدەنگ بڕوانمە ئاسمانی سافی شین و تەماشای قەتارەی ئارامی قولینگ بکەم، بەشوێن یەکا ڕیزیان بەستووە، دەفڕن و دەڕۆن، ئاستەم باڵ بەیەکا دەدەن و، ناوە ناوە کپ و بێدەنگیی بەهار بەئاوازی قولینگانە سیحراوییەکەیان، دەشڵەقێنن، ناو بەناویش تەماشای فڕینی خاڵی تۆکە و وردە گیا و دەغڵودان بکەم و، گوێم لە جریوەی تەیری ئازادی دەشت و دەربێ.

* لە خۆت خۆشەویستر کێیە؟

- ویژدانی خۆم ئەگەر بتوانم هەمیشە مافی (ویژدان)م لەخۆم (واتە: لە هەبوونی فیزیکم). خۆشتر بوێت، مانای ئەوەیە کە منداڵانم و کەسوکارو دۆست و برادەرانی ڕاستگۆو خەڵکی دڵپاکی نیشتمانەکەم، لەخۆم زیاتر خۆش ویستووە، هەرکاتێک (ویژدان) باڵادەست بێت، ئینسان دەبێتە بەخشیارو خۆبەخش و لەخۆبردوو، خەڵکی دیکەی خۆشتردەوێ، هیچ نەبێ دڵیان نارەنجێنێت.

* دڵـت هـەمیشـە لای کێیـە؟

- لەلای خۆمە.

* هـەسـت بەپیربوونی خۆت دەکەی؟

- لەڕووی فیزیکییەوە (جەستەوە)، بەڵێ!

* مـردنی ڕاسـتەقـینە لـەکوێدایە؟

- مـردن بەلێک جـیابوونەوەی جەسـتە و ڕۆحە، هەردووکـیان وەختێک لێک بێزار دەبن، لێک جیادەبنەوە، وەکو ئەوەیە پێکەوە دەمرن، ڕۆح بەبێ جەستە خۆی نانوێنێ (بەرجەستەنابێ) و، دانابەزێتە سەرخاک. جەستەش بەبێ هەناسە و وزەی ژیان (کە هەمان ڕۆحە) ناژیێت. مردنی جەستە دیارە و دەبینرێت، چونکە بەبەرچاوانەوە لە خاکدا دەنێژرێت، لێ ڕۆح نامرێت، دەگەڕێتەوە ئۆقیانوسی (وزە)، تا جەستەیەکی دیکەی بۆ ڕێکدەکەوێت. جا ئەگەر جەستە بە(مـاددە) لێکبدەینەوە و ڕۆح بە(وزە)، ئەوە دەبێت بزانین کە لە جیهانی فیزیکیدا (کە بەلای منەوە ڕەنگدانەوەی، یا نموونەی جیهانی میتافیزیکییە)... هەمیشە (māddə) دەبێتە (وزە) و، (وزە)ش دەبێتەوە (māddə).

وزەش هەمیشەیی و هەتاهەتاییە، کەواتە مردنیان بۆ نییە، مەگەر بەو چەمکە ناتەواوە و، تێگەیشتنە هەرزەکارانە و کرچ و کاڵەی ئێمەی، مرۆڤان، بێت.

مردنی چی؟!

چما مردن هەیە؟ یا گۆڕینی دۆخ و وزەی جۆربەجۆرە؟

* کە تووڕەبی، بە چی سارد دەبیتەوە؟

- بەئاوی سارد! و بەدڵدانەوەی نەرم، بەخۆم زوو لە تووڕەبوون دادەبەزم و دەکەوم، زوویش پەشیمان دەبمەوە، هەرچەندە ڕەنگە پەشیمانی زوو

بەزوو و بەئاشکرا، دەرببڕم. تووڕەبوون هەمیشە بێهوودەیە، مەگەر بەدەگمەن ئەویش لەکاتی هەق و بەشخوراویدایە کە مرۆڤ دەبێ تووڕەببێ و هەڵوێست وەربگرێت، گەرنا زۆربەی جاران لە تووڕەبوون ئەنجامی خراپ و بێهوودە دەکەوێتەوە.

*** هەڵچوونەکانت لەچیدایە؟**

- گوتم: نازانم یەک حاڵەتی هەمیشەیی بۆ تووڕەبوونم نییە. لە دۆخێکەوە بۆ دۆخێکی تر دەگۆڕێت.

*** جوانترین وشە لای تۆ چییە؟**

- هەر وشەیەک لە جێگای خۆیدا جوانە، کەواتە هەموو وشەکان پەسەند و جوانن (ئەگەر لە جێگەی گونجاوی خۆیان بەکاربێن) ئەگەر مەبەستت تەنها یەک وشەیە، بەتەنیا دەڵێم: (بێدەنگی).

*** ئەی ناشیرینترین وشە؟**

- چما وشەی ناشیرینش هەیە ؟!!

ئەگەر مەبەستت یەک وشەیە بەتەنێ بێت، ئەوە هەر وشەیەک بۆ دەمارگیری تانە و بوختان دەرهەقی خەڵکی دیکە، یا بەکەمزانینی ئەم و ئەو بەکاربهێنرێت، وشەیەکی ناشرینە، ئەویش نەک وشەکە بەخۆی، بەڵکو بیر و بۆچوونەکەیە کە ناشرین و ناپەسەندی دەکات.

کەواتە: هیچ وشەیەکی ناشیرین نییە، وشەیەکم پێ بدە، تۆ بەناشیرینی دەزانی، من بەشێوەیەک بەکاری دێنم کە جوانترین وشەی لێ دەربچێت. جوانی و ناشیرینی لە مێشکی ئینسانەوە هەڵدەقوڵێت، جوانی و ناشیرینی وشە لە شێوەی بیرکردنەوە و دەربڕینی مرۆڤەوە دێت، وشەکانمان بەگشتی، لە جوانترین کتێبی پیرۆزو کەلەپووری داهێناندا هاتوون. بۆچی کە لەوێدا بن جوان و پیرۆزن؟ بەڵام کە ئێمە بەکاریان ببەین ناشرین و تاڵ

دێنە بەرچاو؟! چونکە بەجوانی و دروستی بیرناکەینەوە. وشە جوانەکانیش لە فەرهەنگی زۆردارو ستەمکارو خوێنمژاندا دەبن بەسومبلی ڕق وکینە و کوشتن و ستەم و زەبر و زۆر.

* جوانی و ناشیرینی مرۆڤ لە چیدایە؟

- لەشێوەی بیروبۆچوون و دەربڕیندایە. ئەم بیروبۆچوونانە بەڕەفتار، چ ڕەفتاری جوان یا ناشیرین ئەگەر سەرچاوەی بیر و بیرکردنەوە پاک و زولاڵ و چاک بێ، ئەوە قسەی شیرین و کردەوەی چاک و بەرزی لێ دەکەوێتەوە. ئەوەیە کە زەردەشت دەڵێ: بیری چاک، وتەی چاک، کرداری چاک.

* قەت گریاوی؟

- بەڵێ! زۆر جاریش گریاوم، زۆربەی جاران بەتەنیا، لەبەرخۆمەوە تێر تێر گریاوم، بەتایبەتی لە پەشیمانی دوای هەڵە دەرهەقی خەڵک یا دەرهەقی خۆم، یا دوای پەشیمانی لە تووڕەبوون.

* لە مردن دەترسی؟

- هیچ ئینسانێک نییە، بەڵکو هیچ زیندەوەرێک نییە، کەم و زۆر لە ئاستی ئەو چارەنووسەدا برێک ناو بەناوە نەترسابێ و نەحەپەسابێ، لێ کەسانێک هەنە بەشادییەوە بەپیریەوە دەچن، من هەمیشە هەوڵم داوە بەئاستی زەینی ئەو کەسانە بگەم کە تەماشای مردن وەکو پەڕینەوەیەک دەکەن لە ئەم ژوورەوە بۆ ژوورێکی دیکە، یا تێپەڕین لە دەرگایەک، یا گوێزانەوە بۆ (ئەودیو).

ئەمجا لەخۆدەپرسم: ئاخۆ خەڵک... چۆن لە(ئەودیو) تێدەگەن؟ (نەک وەکو بیروبۆچوونی باوی ناو خەڵکی سادەو فریوخۆر) من لە خودی پرۆسەی مردن ناترسم. هەندێ جار بەپەرۆشەوەم، نەبادا بەدروستی لە ڕاز و ڕەمزی مردن و (ئەودیو) تێنەگەیشتبم.

ئەوەی بەش بەحاڵی خۆم پێی گەیشتووم ئەوەیە کە هەر چۆنێک بێ، (ئەودیو) لە ئەمدیو خۆشتر و بەرزتر و ڕووناکترە، تێدا ڕۆحی مرۆڤ ئازاد و ڕزگارە... ڕەهایە... بەتایبەتی ئەگەر لە ئەمدیو ئاسوودە ویژدان ژیا بێ و هەوڵی دابێ و (نیازی وابووبێ) چاکە بۆ خەڵک بکا و، تاپێی کرابێ دڵی کەسی نەڕەنجاندبێ... ئەگەر هەڵەی دەرهەق خەڵک و مافی ئەوان کردبێ، هەوڵی دابێ داوای لێبوردنی کردبێت، یا ئاسەواری هەڵەکانی سڕیبێتەوە. ناتوانم بڵێم من ئەو جۆرە ئینسانەم، کەموکوڕیم ئێجگار زۆرن، هەڵەم زۆرترن.

بە ئاسانی لەخۆم ڕازی نابم، لێ هەوڵ دەدەم... گەر پێم نەکرا بێ، ئەوە نیازم وابووە ئازاری کەس و هیچ زیندەوەرێک نەدەم. بێگومان ئەزموونێکی زۆر سەختە، بەڵام دەبێ نەترسین لە وەڵامدانەوەی پرسیارە ویژدانییەکانی خۆمان. (ویژدان) دادوەر و تەرازوومانە. دەسەڵاتی ڕاستی و ناڕاستی بەدەستی (ویژدانە). ئەگەر ویژدان ئازاد بهێڵین، ئەو دەزانێ چۆن لە خراپە لامان دەدات، قسەم لەسەر(مردن) درێژە پێ داوە، چونکە مردن سەرەکیترین ڕاستییە، نەک ژیان. مردن، ژیانەوەیە لە (ئەودیو) دا، ژیانەوەیەکی بەرزترو پاکتر.

ژیانیش دیوێکی دیکەی مردنە، وەکو مردن دیوەکەی تری ژیانە. لە هەموو حاڵەتدا دەبێ(بە ئاگایی) بمێنمەوە چ لێرە یا لەوێ. کێشەمان (لەخۆ بێ ئاگایی)دایە، بەڕۆژ بێدارین، بەڵام زۆربەی کات بە(بێ ئاگا) ڕۆژ دەبەینەسەر. بەشەو، لەخەوتندا، هۆشیارین، نەک (بەئاگاین). هۆشیاری، ئاگایی نییە، تەمەنمان بە(بێ ئاگایی) دەچوێنین، وەلی ئەگەر (لێرە) بەئاگابین ئیتر (لەوێ)یش بەئاگا دەمێنین. مردن، لەڕاستیدا، ئەنجامێکی جوان و پاکە (بەڵام) نەک لە ڕێگەی خۆکوژی و ئازاردانی خەڵک و خراپکارییەوە. وەکو هەندێ کەس لەسەری دەڕۆن!).

* ئەگەر سەرلەنوێ لەدایک ببیتەوە...؟

- نازانم چۆن و لەکوێ لەدایک دەبمەوە. ئەگەر بهێڵن بەخۆم چارەنووسی گەڕانەوەم هەڵبژێرم... ئەوە وەها دەکەم: بەهەمان ڕێگەی ژیانی تەمەنی ئێستا دەچمەوە، لەهەمان خێزان لەدایک دەبم بەهەمان ویستگە و بەرزی و نشێوی هەمان ئەم تەمەنەدا دێمەوە، تا بتوانم هەڵەکانم ڕاست بکەمەوە، خراپییەکان بسڕمەوە، داوای لێبوردن بکەم لەهەر کەسێک لە من، یا لەبەر من، دڵی ڕەنجابێت (چ ئاگـــام لێ بووبێت یا نەبووبێت)، ئەوەی لێ دەرچێت، چاوم لە تەمەنێکی دیکە و ژیانێکی دیکە نییە و، ئارەزووی گەڕانەوەم نییە.

ئەبەد حەزم لە ژیانە و لە (ئەمدیو) نییە، مردن ژیانەوەیە لە(ئەودیو)دا، لەدایکبوونەوەیە (لەوێ)دا... هێشتا نەمدیوە، لێ وەکو بڵێی دیوومە، بەئاگاهاتن خۆشترین لەزەتی دونیایە.

* ئەی جوانترین کتێب؟

- ژیان، یا گەردوون، یا کات و ساتی ڕۆژانە، هەر چرکەیەکی ژیان جوانترین و کامڵترین کتێبە،(ئەگەر فێری خوێندنەوەی ببین). پێم بڵێ: لەکوێ فێر بوویتە؟ بەڵێ!. کتێبی زیادم خوێندووە، وانەی زۆرم بیستووە، نووسەر و بیردۆزی مەزن لە ژیانما کاریگەربوونە، بەڵام دوا وانە و، فێرنامەم، لەخوێندنەوەی ژیان (سروشت، کۆمەڵگای بەشەری، دەوروبەر، ژیانی زیندەوەران، ڕووداو و کرداری خەڵک ... وەرگرتووە. گەر ئێوە بەئاگابن، دەبینن هەمیشە لە وانەخانەیەکی بێ سنوورن، کتێبی ڕەنگینی کردگار هەمیشە لە بەردەستدا کراوەیە.

* ناشیرینترین کەس؟

- جوانی و ناشیرینی ئینسان لە بیر و بۆچوون و، تێگەیشتن لەژیان و

گەردووندایە. هەر بۆیەش ناشیرینتریان ئەوانەن کە لەخۆیان بێ ئاگان، هەر بۆیەشە کە لەخۆیان ڕازی نابن و کەسایەتی خۆیان پەسەندناکەن، دەچن کەسایەتییەکی تریان هەبێت، ماسکێکی دیکە بپۆشن تا بەخەیاڵی خۆیان کەسایەتییەکی (باشتر) بنوێنن، لە ڕاستیدا خۆیان فریو دەدەن و، دەرهەقی خۆیان و خەڵک زیان دەبەخشن، کارەکان خراپتر لێدەکەن، هەر بۆ ئەوەی (جوانی)خۆیان بنوێنن، واتە: ئەوکەسانە ناشرینن کە وەهای دەرنابڕن کە هەن، بەڵکو چەواشە دەفکرن و دەژێن. ئینسان دەبێ ڕازی و قانع بێ بەوکەسایەتییەی کە هەیەتی، وەکو خۆی... بەو توانایەی هەیەتی، وەکو خۆی... نەک بەچەواشە هەوڵ بدات و باز بەسەرخۆی و بەسەر خەڵکیدا بدات، لە ئەنجامدا نەخۆی پێبگات، نەش بهێڵێ کارەکان بەدروستی بڕۆن، نە ڕێگەش بەخەڵکی تر بدات.

*** ئەی دڵداری؟**

- دڵداری (بەو مانا سادەیەی کە خەڵک بەگشتی دەیناسن) پلەیەکە لە پلە جۆربەجۆرەکانی خۆشویستن و میهرەبانی. پلەی لەوەبەرزتر، میهرەبانی هەیە، زۆریش بەرزتر، کە چەسپاوترە. لەهیچ پلەو جۆرێکی خۆشەویستی کەم ناکەمەوە، چونکە هەموویان لەژێر ناونیشانی میهرەبانی یەک دەگرنەوە، میهرەبانیش مایەی ژیانی کۆمەلایەتی بەشەرو زیندەوەرانی دیکەشە، ئەگەر (عیشق) بەیەکێک لەپلە هەرە بەرزەکانی میهرەبانی بزانین ئەوە مەلای جەزیری دەڵێ:

عیشق ڕەگەزی (عونسری) پێنجەمی وجودە، دوای چوار عونسری: هەوا، ئاو، خاکو ئاگر. کەوابێ (میهرەبانی)دەبێ وابکات لە ئینسان... وەکو هەوا فێنک و وزە بەخش بێ، وەکو ئاو ژیان بەخش بێ، وەکو خاک نەرم و هێمن و خاکەڕا (متواضع) بێ، وەکو ئاگر ڕووناکی گەرم بەخش بێ.

ئەگەر مرۆڤ لە تەنیا یەک پلەی خۆشەویستی ڕاوەستاو ڕچەو ڕێگاکانی دیکەی میهرەبانی نەدۆزیبەوە و تاقی نەکردەوە، ئەوە لە باییینی (ریز)ی عاشقان، لەیەکەمی سەرەتایی، دۆش داماوە و بەجێ ماوە.

بەلای منەوە، ئینسان دەبێ تێگەیشتن و چێژو ئاسۆی میهرەبانی خۆی ئەوەندە فراوان بکاتەوە بتوانێ(بەخۆشەویستی ژیان و گەردوون) بگات و، ئاوێتەی وزەی هەمیشەیی هەبوون بێت، ئیتر هەمیشە لە ئاهەنگی عیشقدا بژێت.

لەلات سەیر نەبێ ئەگەر بلێم: مرۆڤ دەبێ خۆی خۆش بووێ، تەواوی ئەو شتە بەرزانەی وجودی ئەو پێکدێنن و خۆش بوێ، لەخۆی پەست و بێزارنەبێ هەروەکو لە وەلامێکی پێشوودا گوتم: بەکەسایەتی و (خواداوەکانی)خۆی ڕازی بێت.

تا نەزانی و نەتوانی خۆت (ئەم وجودە بەرزەی وجود) خۆش بوێ، ناتوانێ بەدروستی و ڕاستی هیچ کەسێکی دیکەت خۆش بوێت.

*** نووسەر بێ دلداری دەژی؟**

- مەگەر هەیە ئینسانێک بەبێ خۆشەویستی بژێ، هەرچەندە زۆر جار پەی بە(هێزی نادیاری خۆشەویستی) نابات کە دەیورووژێنێ، ڕەنگە وا باوبێ (کە بەهەڵەی دەزانم) گوایە شاعیرو نووسەر لەهەموو کەسێک زیاتر عیشق و میهرەبانی دەنوێنن.

ئەم هەڵە گەورەیە وادەکات لە هەندێ شاعیرو نووسەر (ئەگەریش کوورەی ڕاستەقینەی عیشقی ساردوسڕ بووبێتەوە و، بەخۆڵەمێش وەرگەڕابێت) بەڕواڵەت هەر واپیشان بدات عاشقەکەی جارانەو، پەخشان و شیعری هەڵبزرکاوی ناجۆرو سەردو سڕ دەنووسێت، ئەگەریش تین و گەرمایی عیشقی گڵپ گرتووی کوژابێتەوە.

هەر شاعیرو نووسەرێک ڕەنگە یەک دووجار ئەگەر بەخت یاری بێت،

تەنیا (٥-٦) جار بتوانێت شیعری ڕاستەقینەی ئاوێتەی جۆش و خرۆشی عیشق و خۆشەویستی بنووسێت، گەرنا زۆربەی وەخت وەکو کەنوویەکی بەتاڵی لێ دێ، هەر چییەک بڵێ ڕووکەش و ساردو بێ تامە، تەنیا بۆ ئەوەیەتی بڵێ کە هێشتا ماوە!.

درۆ و فریودان و خۆ هەڵکێشانی بێهوودە، پڕی جیهانی شیعر و ئەدەبیات و هونەرن. لەسەرێکی دیکەوە شاعیرو نووسەرو هونەرمەندی بلیمەت و لوتکە هەنە (کە دەگمەنە، زۆر کەمن) تا دوا هەناسەی ژیان لە عیشق و میهرەبانیدا دەژین، هەرچی دەڵێن و دەیڕەنگێنن لەسەرچاوەی سروەی (ئیلهام)ی ژیان و گەردوونەوەیە.

ئەم عاشقانە بۆ ڕۆژێکیش لەداهێنانی عاشقانەو (میهرەبانانە ناکەون!. ئەمانە (نایانەوێ) عاشق بن و ڕەنگی خۆشەویستی بنوێنن، پێویستیان بەوە نییە، چونکە بەخۆیان پارچەیەکی خۆشەویستین، لەو ئاگردانەدا تواونەتەوە، ئیتر خۆیان عیشقن، عیشق خۆیانە.

هونەری خۆشەویستی ئەوەیە کە خۆت ببیتە حاڵەتەکە نەک لە دەرەوەی ببیت بەبڵێسەکە دەست گەرم بکەیتەوە!.

شاعیرو نووسەری وەها هەنە، کە زۆربەی وەخت، بەبێ خۆشەویستی دەژین. ژیان دەبەنەسەر، بەڵام بەبێ عەشق. کەسانێکی وەهاش هەنە (کە هەرە زۆرن) نە لە سەر عیشق دەدوێن، نە شیعر دەڵێن، نەپەخشان دەنووسن، نەگۆرانی یا نیگارکێشی... بەڕواڵەت هیچ نازانن، بەڵام لە دڵەوە ئاوەدانن، لە بەزمی گەورەی خۆشەویستیدان، پڕاوپڕی ژیانیان عیشق دەچێژن، بەبۆن و بەرامەی میهرەبانی مەست و بێهۆشن، یا بەئاگایی گەش دەژین، کە هیچ شاعیرو نووسەرێک ناگاتە پلەوپایەیان لەخۆشەویستیدا.

شەرابی خۆشەویستی ڕازو نهێنیی خۆی هەیە، کەس نازانێ کێ و چۆن

و کەی دەینۆشێت و... کێن ئەوانەی مەستی بوون بێ ئەوەی هیچ بدرکێنن.

هەندێ شاعیرو نووسەر ئەوەندە خۆپەرستن، فێربوون ئیدعای خۆشەویستی بەخەڵک دەفرۆشن، لەوەش بێ ئاگان کە خەڵک دەتوانن ناخی دەروونیان بخوێننەوە، هەرچەندە بەڕوویان نادەنەوە. خەڵک هەروەها، شاعیرو هونەرمەندی بەرزی عیشق پەروەر دەناسن و چێژ لە داهێنانیان وەردەگرن.

* ڕاستە زۆر گوێ لە مۆسیقا ڕادەگرن؟

- ئەدی چۆن؟... مۆسیقا خۆراکی گیانە. لە مۆسیقای خۆماڵی، هەروەها لە مۆسیقا گەلانی دیکە، کلاسیکی و نوێ، چێژ وەردەگرم، هەوڵ دەدەم چێژ وەربگرم.

ئەلبێرت ئەنیشتاینی فیزیازانی بەناوبانگ، دەڵێ: کە بە(مەشقی گوێگرتن لەهەر مۆسیقایەک... مرۆڤ دەتوانێ ئاشنای ببێ و چێژی لێ وەربگرێت. مەشق بکە، فێر بەچۆن گوێ بگری).

مۆسیقا، شادی بەخشە، ئازادی بەخشە، لە ستەمی ڕۆژگار دوورت دەخاتەوە، بەڕیتم و ئاهەنگی تایبەتی خۆی، مۆسیقا هارمۆنی بەگیان و مێشک و دەروون دەدات.

مۆسیقا، لەسەرەتاکانی ژیانی مرۆڤدا، شادی بەخش بووە، بۆ خۆشی و ئاسوودەیی و سرەوتن پەیدابووە، ڕزگار بەخشی ڕۆح بووە لە نەزانین و زۆرداریی لەش و کۆمەڵگا. مۆسیقای ڕەسەنی کوردی شادی و خۆشی بەخش بووە. ئەبەد ئاهەنگ و بەزمی خەماوی و پەستی و داماوی نەبووە. وادیارە هەزار ساڵ بەم لاوە هونەری مۆسیقاو گۆرانی کوردی و بەهونەری خەماوی و گریاوی عەرەبی و میللەتانی دیکە، ئاوێتە بووە، تێکچووە و لە سەرچاوەی شادی بەخشی خۆی دوورکەوتۆتەوە.

*** مۆسیقات بۆچی خۆش ویستووە؟**

من وەهای لێ تێگەشتووم.

مـۆسـیـقـام بۆ شـادی و دڵگەشـانەوە ویسـتـووە، بەڵام هەندێ جـار کەوتوومەتە ژێر کاریگەرێتی مۆسیقای خەمهێنەرو پەست و بێزارکەرەوە.

بڕوانە: وشەی (شـایی) کـوردی، لە وشـەی شـادییـەوە هاتووە، لەهیچ شاییـیـەک داخ و پەژارە و پەستی و بێزاری دەبینی؟!... یاخۆشی دەبینی و هەست دەکەی بارێکی قورست لەسەر شان لادەچێت!.

ئەوە مـاک و ئەسڵی ئاوازو ئاهەنگی مۆسـیـقـایە. هەڵپەڕکێ و گـۆرانی جەستەو ڕۆح ڕزگـار دەکات. ئەمڕۆ بەچاوێکی گەشی نوێوە ڕۆڵـی (سەمای ڕۆژهەڵات) هەڵدەسەنگێنین نەوەک جموجۆڵی سیکسییـانە، بەڵکو وەکو دەرمانی ڕزگاری بەخش تەماشای دەکەن.

شایی سادەی کوردی نموونەیەکی دێرینی سـەرچاوەی هەرەکـۆنی هونەری مۆسیـقـا و گـۆرانییـە. لە کـۆندا (تا ئێـسـتـاش لە هەندێ جـێگەدا) ئاوازو ئاهەنگی مۆسیقای ئاینیش شادی بەخش و ڕزگاری بەخشە.

لە دەف ژەنینی سادەی کۆڕی دەروێشانی تەریقەتەکاندا ئاسەواری خەم و ترس و پەژارە و دڵەڕاوکێ نابینین.

ڕەنگە هەر ئەو هارمـۆنە ڕزگـاری بەخشـەیە کە ئامادەبووانی ئەو کـۆڕانە لەکۆت و بیروبۆچوونی سـەرکوتکەرانەی ڕۆژگـار، ئازاد دەکات و دەیانخـاتە دۆخێکی ڕۆحیی دیکەوە.

من، لە مـۆسـیـقـای کوردەواریدا، شـەیدای ئاوازی تەمـیـرە (تەمـبوورە)ی کـرمـاشـانیم، بەڵام لە هەندێ هونەرمـەندی ئەو هەرێـمـە هاتوونە ئاوازی ئازادی بەخشی تەمیرەیان تێکەڵاوی هەندێ ئاهەنگی خەمهێنەری فـارسی کردووە و تێکیان داوە.

تەمیرەی سادەو ڕەسەنی کرماشانی، بەخۆی دوورە لەخەم و پەژارە و ترس و نائومێدی...

بەلای منەوە ژیان (ژیان بەگشتی، بەر لە پەیدابوونی ئادەمیزادیش) لەسەر بنجی شادی و خۆشی و ئازادی ڕواوە. ئەم وجودە بەئاهەنگێکی شادی هێنەری سیحراوی ڕەها، خولقاوە.

لەژیاندا دەبێ دەست بەسەرچاوەیەکەوە بگرین کە شادی و شادمانییە.

لێرەدا وشەی شادی بەمانای(فەرەح)ی عەرەبی دەبەم.

مافی هەر ئینسانێکە لە ژیانیا (شاد) بێت، ئەگەر هەمیشەش نەبێ، زۆربەی وەختی بەشادمانی بگات. چونکە ئەم ژیانە، ئەم گەردوونە، ئەم هەبوونە، بۆ شادییە.

پێوەندی و سیستەمی کوێری ژیانی کۆمەلایەتی وەهای کردووە مرۆڤ نەتوانێت ڕێگای (شادبوون) بدۆزێتەوە. شادی هەمیشە لەبەردەستایە، بەلام مرۆڤ، یا نایدۆزێتەوە، یا دابونەریت و بیروبۆچوونی بێهوودە چاوی بەستووە تا نەیبینێت.

شادی، لە شتی بچووکی ڕۆژانەدایە، تۆ دەتوانی سادەترین کاری ڕۆتینی بەدڵ و گیان ئەنجام بدەیت و پێی (شاد) ببیتەوە. دەتوانی پێوەندی مرۆڤ دۆستانەی سادە بکەیت بەبۆنەیەکی شادی بەخش. دەتوانی لە پەروەردەی دەرەخت، لە یارمەتیدانی خەڵک، لە دڵدانەوەی داماوێک، لە داوای لێبووردنێک، لە دواخستنی سفرەی خواردن و پاکی و ڕووخۆشی و میهرەبانی لەگەڵ منداڵەکانت، لە دیتنی پەڵە هەورێکی سپی لە ئاسمانی شین و سامالدا یە، یا لە پۆلە تەیر، یا رووبارێکی بچووکی هێمن و زولاڵ و... لەسەدان و هەزاران دیمەنی سروشتی و مرۆڤایەتی شادمان ببیت.

تۆ بۆ شادمانی خولقاوی، ڕوحیەتی شادمانی لەلای خۆتە و بەدەستی خۆتە، چاوەڕێ مەکە بۆتی بنێرن، کەس بەتۆی نابەخشێ، خۆت نەبی...

مەگەر کەسێک هونەری شادی بەخشین بزانێت، ئەوەش بەهرەیەکی نایابە، نیعمەتێکە. لە وەڵامێکی پێشوودا، باسی مردن و جوانی و پاکی (ئەودیوم) کردووە، مەبەستم بێزاری لە ژیانی ئەمدیو نییە، بەڵکو لەمردنیشدا لایەنە شادەکەی دەبینم... هەروەکو لە ژیانی ئێستادا.

ئەگەر ئەم دیو بۆ شادی خولقابێت، دەبێ ئەودیویش تەواوکەری شادی بێت، بەڵکو بەرزتر...

لەگەڵ (بەئاگا هێنانێک)... شادی، ئەبەد لە زۆرداری و ستەمکاری و زەوتکردنی مافی خەڵکەوە نایەت (هەرچەندە لەو ڕێگا نالەبارەوە دەوڵەمەند و بەدەسەڵات و دەست ڕۆیشتوو بی، هەمیشە لەو شادومانی ڕۆحییە بەرزەوە دوور دەمێنی) مۆسیقا، لەلای بەندە، ئەو شادی بەخشە نادیارەیە. دەمهێنێتەوە لای خۆم، بەئاگام دێنێ، لەگەڵ هارمۆنی گەردوون ئاشتم دەکاتەوە.

مۆسیقا، سروەی پەروەردگارە، سروەی ئاهەنگی وجودە، کێ هەیە لێی بێ نیازبێ؟! کەس نییە... لێ ئەوانەی ناچنە ئەو میهراوەوە (میهراو= محراب) کە لە وشەی (میهر)ەوە هاتووە، ئەسڵەکەی بۆ ئایینی بەر لە زەردەشت دەگەڕێتەوە، لەو دەمەشدا بۆ هەمان مانا بەکارهاتووە، کە جێگای نزاو ستایش و خواپەرستییە)... ئەوانەی ناچنە ئەو (میهراو)ەوە، گەر نازانن تەمەنیان بەفیرۆ چووە، گەر دەزانن و خۆیان بەدەستەوە نادەن و دان بەملهوڕی خۆیاندا نانێن، ژیانیان دۆزەخە، چ لێرە یا لەوێ، چونکە دڵ و دەروون و هەستی مرۆڤ دەبێ (پڕ)بێ، ئەگەر بەعیشقی ئاهەنگی وجود پڕنەبوو، ئەوە بەکینەو دڵڕەقی و خەمی داماوی و دڵەڕاوکێ و گومڕاییەوە دەبێ، ئەو بۆشاییەی کە میهر بەجێی هێشووە، بەژارو ژەنگ و چڵکاوییەوە دەخنکێت.

* تا چەند لە سیاسەت بێزاری؟

- ژیان گەمەیەکی سیاسییە، گەمەیەکی خۆشە، من لەو جۆرە سیاسەتە هەرگیز بێزار نیم، چونکە دەزانم هەموومان، لەناو خێزانەوە بگرە تا گەڕەک و قوتابخانە و جێگەی کارو حزب و حکومەت و دەزگاکانی دیکەی سیاسی و کۆمەڵایەتی، هەمیشە لە بازنەی بازیی سیاسەت داینە... بەو مانایە کە سیاسەت (یارامیاری) گەمەی دەسەڵاتە، لە دەسەڵاتی سەرۆکایەتی تیپی فوتبۆڵەوە، تا بەڕێوەبەرایەتی قوتابخانە، موختاری گەڕەک، پلەوپایەی شارەوانی، حکومەت، حزب، کۆمەڵە، سەندیکا، تیمی هونەری، بەدەستهێنانی پایە یا مووچەی باشتر، یا وەرگرتنی خەڵات، بەدەست هێنانی دڵی ئەم و ئەو (دڵداری هەندێ جار جۆرە خۆسەپاندنێکە بەسەر دڵی ئەوانی دیکەدا) و... دەیان ململانێ و زۆرانبازی تر کە لە جیهانی ئاژەڵ و تەیرو توارو خشۆکەکانیشدا دەبینین...

کەوابێ، گەمەی سیاسی بەشێکی ژیان و هەبوونمانە، ناتوانین خۆمانی لێ لابدەین، چ بێزار بین یانەبین، جا باشترو بەشادییەوە ڕۆڵی سروشتیی خۆمان بزانین، بەمەرجێک چاکەکە و پاکەکەی هەڵبژێرین، ئینسان دەتوانێ ئەمەیان بکات، لەسەرێکی دیکەوە دەڵێم:

بەڵێ! من زۆریش لە (سیاسەت) بێزارم! لەکام سیاسەت؟!... ئا لەم گەمە نزمەی کە بەناوی سیاسەتەوە لە وڵاتەکانمان بەڕێوەی دەبەن. زۆر جار کەسانی نەفام و ناشایست و بێ توانا و بێ بەهرە، نەک لەڕێگەی زانستییانەی گەمەی سیاسەت و لێوەشاوەیی و دڵسۆزییەوە، بەڵکو لەبەر حیسابگەلی پڕوپووچ و، لەسەر حیسابی وەخت و سامانی خەڵک، (گرەو)ی سیاسەت دەبەنەوە، هەرچەندە لە ئەنجامدا هەرشکست دێنن، بەڵام دوای چی؟ دوای بەفیڕۆدانی وەختێکی گرانبەها و توانا و وزە و سامانی خەڵک.

من لەو جۆرە سیاسەتە بێزارم، دیارە ڕزگاربوون لەو دیاردەیە سانا و ئاسان نییە، زۆربەی کۆمەڵگاکانی دونیا پێوەی گلاون، بەڵام وەختێک گەمەکە تۆزێک زانستییانە دەکەوێتە سەر جادەی خۆی، ئەوکات گەمەی سیاسەت دەبێتە خۆشی، لە جیاتی بێزاری.

گلەیی لە هیچ کەس ناکرێت، ئەگەر هەوڵ بدات دەسەڵاتێکی سیاسی بەدەست بهێنێ. مافی خۆیەتی، بەمەرجێک شایانی ئەو پلەو کارە بێ.

دەچمە سەرتیۆری زانایەکی فەرەنسی، زانستی سیاسەت، کە دەسەڵات و سیاسەت، بەپاسەوانی سەگ لەو سنوورەی بۆ خۆی دایناوە، پێناسە دەکات.

لە دێهات هەر سەگێک ئاقارێکی هەیە، لەوە زیاتر هەر سەگێک و هەر جانەوەرێک ڕەت بێ هەقی پێوەی نییە، بەڵام ئەگەر سنوورە نادیارەکەی (لەلای خۆی دیارە) بەزاند ئەوە هێرشی بۆ دەبات، من لەم سیاسەتە سروشتییە بێزارنیم. هەرکەسێک مافی خۆیەتی، لەسنووری شەرعیەتدا، دەسەڵاتی خۆی بپارێزێت، من لە سیاسەتی سەگ بێزارنیم، بەڵام لە سیاسەتی هەندێ بەشەر بێزارم.

*** ڕاستە دەڵێن فەلەکەدین کاکەیی تەنیا بۆ نووسین دەژی؟**

– نەخێر! (بە)نووسین، نەک(بۆ) نووسین. دەژیم من تازە خەریکم فێری نووسین دەبم، پتر لە چل ساڵە خەریکی مەشق و خۆڕاهێنانم. لەمە بەدواوەش دڵنیانیم کە بتوانم بەچاکی بنووسم.

نووسین، هونەرو زانست و هزر و بڵند خەیاڵییە، پلەیەکی بیرکردنەوەیە، با دروستتر بڵێم: وزەی بیرکردنەوە لە ڕامان و تێفکرین و داهێنان لە هەندێ حاڵەتی نووسیندا بڵق دەدات و خۆی دەنوێنێ، تا نەنووسین نازانین چۆن بیردەکەینەوە هەربۆیەش دەڵێین کە (وشە ئامانی بیرە)، یا... وشە چوارچێوەی جەستەی دەربڕینە.

کەواتە نووسین بیرکردنەوەیە، بەو مانایەی کە نووسین بەرزترین کرداری ئینسبانە، بەرزترین داهێنانە.

هەموو کەسێک بیردەکاتەوە، چ لە بێداری ڕۆژدا یا لە نووستنی شەودا، وزەی بیر لە کارناکەوێ، شەپۆل دەدا... ڕووبارێکی نەوەستاوەیە هەمیشە دەڕوا... دێت و دەڕوا کەس ناتوانێ تەوژم و جووڵەی بیرکردنەوە ڕابگرێت. (نرڤانا)، یا هەرناوێکی دیکەی بەرزترین پلەی ڕۆشنبینی و ڕەهایی ڕۆح، ئەو دەمەیە (چ لەحزەیەک بێ، یا کاتژمێرێک) تێیدا ئینسان بەسەر جەرەیانی بیری خۆیدا زاڵبێ و ڕای بگرێت... لەهیچ بیرنەکاتەوە و، ئاسوودە بێت.

ڕەنگە زیندەوەرو بوونەوەرەکانی گەردوونیش، بەگشتی، لە وزەی بیر (یا ڕاستتر بڵێم: هەست و دەرک) خاڵی نەبن.

*** پرۆسەی نووسین لای بەرێزتان چ حاڵەتێکی ڕوحی دەگەیەنێت؟**

- منێ کە تازە فێرە نووسین دەبم، دان بەوەدا دەنێم کە لەچمکێکی تەسکی لاوازەوە، لە هونەری نووسین تێگەیشتبووم، هەر دەربڕینێک (واتە هەر ڕەنگدانەوەیەکی هەڵبەز هەڵبەزی شەپۆلی بیروهەست و سروە) نووسینە.

نەخوێندەوار، وەکو خوێندەوار، بیردەکاتەوە، جیاوازییان لە هونەری دەربڕینە، منداڵ وەکو پیر، ژن وەکو پیاو، مرۆڤ لە هەرجێگەی جیهان بێت، لە پرۆسەی فیزیکی و میتافیزیکی (نەک لە ئاستی زانستی و مەعریفیدا)، وەکو یەک لەبیرکردنەوە ڕزگاریان نابێت.

پرۆسەی بیرکردنەوە، لەلای هەزاران ملیۆن کەس، دێت و دەڕوات، بێ ئەوەی خۆی بنوێنێ... تەنیا لەلای نووسەرو هونەرمەندو زانیارو داهێنەراندا، ئەو پرۆسەیە لە شێوە و چوارچێوەی جیاجیادا بەرجەستەدەبێ... دەبێ بە وشە و ڕستە و لاپەڕە، یا بەتابلۆی شێوەکاری،

یا ئاوازو مۆسیقا، یاسەماو هەڵپەڕكێ، یاهونەری بیناسازی، یا گۆڵكاری، بیرۆكە و فۆرمی زانستی... تاد!.

دەتوانیت لە هەموو ئەو ئەنجامانە، ناوی (نووسین)، یا ناوی (بەرهەمی هونەری و زانستی)بنێیت، لێ ناوەكە لە ناوەڕۆكەكە ناگۆڕێت.

تۆ ئێستا ئالێرەدا كە هەی، ئەم وشانە دەخوێنیتەوە، لە بیركردنەوە بەردەوامی، دوای تەواوبوونی خوێندنەوەش، تۆ لە بیركردنەوە ڕاناوەستیتەوە، زەحمەتتر كار (ڕاو) كردنی بیروبۆچوون و بیرۆكە و خەیاڵە، كە ناتوانی بەئاسانی بیانگری و بیانخەیتە قەفەزی وشە و دەربڕینی جۆربەجۆری هونەرییەوە. تا یەك بیرۆكە، یا یەك چرپەی بیرت بۆ دەگیرێت، هەزاران شەپۆلی خێرایی بیر، بەمێشك و دەروونتا دێن و دەچن... زوو بەزوو ئاوا دەبن و گل نادرێنەوە.

لەوەڵامی پرسیارەكەت كە ئایا من (بۆ) نووسین دەژیم؟! نەخێر! من (بە)نووسین دەژیم، نەك (بۆ) نووسین. گرنگ نییە چی دەنووسم (هەزاران لاپەڕەی داهێنان دەنووسم و دەدڕم)... گرنگ خودی پرۆسەی نووسینە، كە ژیانە. چونكە بیركردنەوە مەزنترین بەشی نادیاری وجودی بەشەری پێك دێنێ، ئەو بەشەی لێ دەركە پەیكەرێكی فیزیكی بێ هەست و نەستی دەمێنێتەوە. بۆ ئەوەی لە هونەری نووسین دوا نەكەویت، دەبێ ناوە بەناوە چیت نووسیوە فڕێی بدەیتە زبڵدانەوە(واتە فەرامۆشی بكەو وابزانە هیچت نەنووسیوە)، سەر لەنوێ بیربكەرەوە.

مرۆڤ، هەندێ جار، وەكو (شمشاڵ) دێتە بەرچاو، تا شمشاڵ ژەنی هونەرمەندی شارەزا فووی پێدانەكا، شمشاڵەكە نەدەنگی دێ، نەهیچ ئاوازو ئاهەنگێك دەزانێ.

گەردوون (ژیان، سروشت، هەبوون) شمشاڵژەنەكەیە... كردگار شمشاڵژەنەكەیە، دەبا تەسلیمی ئەو ببین.

تۆ کە شمشاڵێکی و هیچی تر، دەبێ ئامادەبیت خۆت بدەی بەدەستییەوە، تا بەئازادی و ڕەهایی بتهێنێتە ئاوازو جۆش و خرۆش، ئەو کاتەیە کە شەپۆلی نووسین، خۆبەخۆ بلّق دەداو دەکەوێتەڕێ، ئاوی ڕەوان چەشنی بیرکردنەوەی ئارام و زولاڵە.

مەپرسە و مەڵێ: تۆ (بۆ) نووسین دەژییت؟

نەخێر! نووسین دەربڕینی خواست و حەزێکی نادیاری هەرە دووری گەردوونە، من بە(نووسین) دەژیم، وشە نەبێ... بەگوتنەوەی ئاوازێک دەیلێمەوە، بەهەر شێوەیەکی دیکەی دەربڕین دەینوێنم.

وابزانم دەبێ هەموو کەسێک وەهابێ چ بەخۆی بزانێت یا نەزانێت، مرۆڤ زۆربەی حالاتی بیرکردنەوە و نووسین بە(ناگایی) ئەنجام دەدات، ناشزانێ بۆچی؟!.

** کە دەنووسی، بیر لەچی دەکەیتەوە؟**

– دەمێنێتەوە سەر ئەو دەمەو، سەر ئەوەی چ بابەتێک دەنووسم، ئەگەر خەریکی نووسینی سووژەی کۆمەلایەتی و سیاسی و لێکۆڵینەوەی ڕۆشنبیری ببم ئەوە لە کاتی نووسیندا بیر لە ڕاستی و دروستی زانیارییەکان، ئامارو مێژووەکان، زاراوە و ڕستەکان دەکەمەوە (کە هەوڵ دەدەم سادەو ڕوون دەرچن)، هەوڵ دەدەم زانیاری دروست و مەبەستی ڕوون بەخوێنەر بگەیەنم.

خۆ... ئەگەر بابەتی هونەری داهێنانم بەدەستەوە بێ (کە زۆر دەنووسم و ئێجگار کەم بلاودەکەمەوە)... ئەوە خۆم بەدەمی شەپۆلی بیرکردنەوەوە دەدەم.

مێشک و دەستم ئازاد و ڕەها دەیلێم... ئا ئەوە (من) نەبم کە دەنووسم بەلکو (گەردوونە) خۆی لە ڕێگەی منەوە دەنووسێت. خۆم ماندوو و تەنگەتاو ناکەم، پاڵەپەستۆ نابەمە بەر مێشک و دەروونم، بەلکو دەهێڵم

جەرەیانی بیرکردنەوەم، وەکو هەیە، خۆی بنوێنێ، من لەو حالآتە ئازادانە دەترسم... لەبەریەک هۆ، ئەویش مەترسی پچڕاندنیەتی لەلایەنی دەوروبەر و کاروباری ڕۆژانە و پێوەندیی کۆمەڵایەتییەوە.

جاری وەها هەیە، دڵنیام ئەگەر لەیەک جێگە، بەبێ پچڕانی هۆکاری دەرەوە، لەسەری بڕۆم، سەدان لاپەڕە دەنووسم... لێ مخابن! هەزاران جار مخابن!.

هەمیشە لێمی دەپچڕێن دەیان لاپەڕە یا کەمتر دەنووسم و بەناچاری ڕایدەگرن، جارێکی تر ناتوانم بگەڕێمەوە سەری... زۆر زەحمەتە نەک لەڕووی تەکنیکی نووسینەوە، بەڵکو لەڕووی پرۆسەی بیرکردنەوە. هەربۆیەش دەیان پرۆژەی هونەریی ناکام و نەگەیشتوو، وشک و سیس دەبێتەوە و... بەناچاری دواجار، تووڕی دەدەم! یەک مانگ، تەنیا یەک مانگ بواری ئازادیی و ڕەوانی نووسینم هەبا، ڕەنگە شتێکم بنووسیبا! بەرزو سەرکەوتووش نەبا، هیچ نەبێ بەدڵی خۆم دەبوو!. هێشتا پڕ بەدڵی خۆم نەمنووسیوە!.

بڕواناکەم ئەزموونی من لەهی نووسەرانی تر جیاوازبێ. ڕەنگە زۆرکەس تووشی هەمان ببوبن. نووسینی هونەری، هەندێ جار وەکو (کڕکەوتنی مریشکە)، بەسەر هێلکەوە بمێنێ تاجووجەڵەکان لە هێلکە دەردەچن.

بۆیان گێڕامەوە: کیژێکی کورد نامەیەکی بۆ (گۆنتەر گراس)ی ڕۆماننووسی ئەڵمانی دەنووسیت، پرسیارێکی لێ دەکا، سکرتێری گراس وەڵام دەداتەوە کە ئێستا کەس نابینێ، هیچ ناخوێنێ، قسە ناکا، چونکە ڕۆمانێکی تازە دەنووسێ، ئەم حاڵەتە ساڵێک دەبات، دوای نووسینی چەند مانگ دەحەسێتەوە، ئەمجا دەگەڕێتەوە ژیانی کۆمەڵایەتی. تکایە چاوەڕوان بە. هەر وەختێک گەڕایەوە، پرسیارەکەی دەخەمە بەردەست (وەڵامنامەکەی سکرتێری گۆنتەر گراسیان پیشان دام).

* بێدەنگی لای تۆچی دەگەیەنێت؟

- بێدەنگی، گوتم: کە ئەگەر بڕیاربێت تەنیا یەک وشەی جوان هەڵبژێرم، ئەوە وشەی (بێدەنگی)یە. بێدەنگی، واتە قسە نەکردن و، قسەنەبیستن... بەڵام هەرچەندە بێدەنگ بیت لە (دەنگ) ڕزگارت نابێ، کە دەنگی وجودە، زرنگەی دێ وەکو زەنگۆڵەی قەتاری کاروانێکی دوور.

بێدەنگی، ڕێزنانە لە گەردوون، لەهەبوون، لە ماکی ژیان... سەرەتاش (دەنگ) بووە ئەو تەقینەوەیە (بێگومان دەنگێکی سامناکی لێ کەوتووەتەوە) چەرخی ئەمدیوی وجودی خستووەتە خولان، ئینسان، ناوە بەناوە، پێویستی بەحالەتێکی (بێدەنگی) هەیە، وەکو بچێتە خەڵوەتخانەوە، تا بەئارامی لەخۆی ڕابمێنێ، بەخۆیا بچێتەوە، تا ئەو ڕادەیەی خۆی بدۆزێتەوە، پێوەندیی بەچەرخی ژیان بناسێتەوە...

ئەو مرۆڤەی بتوانێت وجودی خۆی، لەبێدەنگیدا، بدوێنێ... بەئاسانی گەنجینەی تازەی شاراوەی ژیانی دەدۆزێتەوە، دەبینێت کە چەندین پارچە ئەرزی بەیا ڕو نەکێڵدرا و لە وجودیا هەنە، پێویستییان بەگاسن لێدان و تۆ و ئاودێرییە...

(ئەم بیرۆکەیە «بیرۆکەی زەوی بەیار»، لە ژنەر ڕەبەنێکی بەئاگای ئەمریکیم گوێ لێ بووە).

من، بەسروشت، حەز لە ئاخافتن (قسەکردن) ناکەم، لێ داب و نەریتی کۆمەڵایەتی ناچارم دەکات بدوێم، چونکە هەست دەکەم کە ئەگەر لەگەڵ ئەم و ئەو قسە نەکەم ڕەنگە زویرو بێزاربن، یا وەها بزانن، خوانە خواستە، بەکەمیان وەردەگرم... گەر نا لە قسەکردن بێزارم، مەگەر لە حالاتی زۆر پێویست نەبێ، هەندێ جاریش، لەبەر کاروباری سیاسی و کۆمەڵایەتی، ناچارم ئەوەی دەیزانم بیڵێم، کە بەخەیاڵی خۆم ڕەنگە سوودبەخش بێ، هەرچەندە ڕەنگە وەها دەرنەچێت، چ بڵێم یا نەڵێم، وەکو یەکە! زۆربەی

جاران دوای ئاخاوتن پەشیمان و پەست و بێزارم... لە خۆم، نەک لە خەڵک، زۆر شتیش هەیە حەزم لێ نییە بیبیستم، لێ بەناچاری لەبەر ئەدەبی گوێ ڕاگرتن، گوێی بۆ شل دەکەم.

هەزاران قسەت بەسەرا دەبارێن، زۆربەیان بێهوودە و بێ مایەیە، ناچاری بیانبیستی، هەندێ جار هەڵدەچی و دەکەویتە ناوی... چ دەردەسەرییەکە! بێدەنگی، هیچ نەبێ قسەنەکردن، شادو لەزەت بەخشە، دەتباتەوە بۆ سەرچاوەی ژیان، جارێکیان لە ئاخافتن مانم گرت، بڕیارم دا... لەلای خۆمەوە گوتم: ئەرێ... کابرا! بەس نییە؟ تۆزێک ئۆقرە بگرە.

لە(ڕاژان) بووین، بارەگای مەکتەبی سیاسی پارتی، هاوینی ساڵی ١٩٨٨، بەر لە ڕاگرتنی شەڕی عێراق و ئێران، گوتم: هەڤاڵینە! من چەند ڕۆژێک (ڕۆژووی بێدەنگیم) هەیە. تکایە مەمدوێنن. ڕۆژانی یەکەم و دووەم هەندێ برادەر بەدەستی ئەنقەست هەوڵیان دەدا بمهێننە قسە خۆم ڕاگرت. گوێم دەگرت و هەرچیم پێ بکرابا ئەنجامم دەدا، وەلی ورتەم لێوە نەدەهات، زۆر زەحمەت بوو. تەنیا چەند کاتژمێرێکی شەو نەبێ، ئیتر هەمیشە ئاخاوتن و قسەو گفتوگۆو ژاوە ژاو بوو، بارەگایەکی مەکتەبی سیاسی حزبێک، لە جێگەیەکی بچووکی کراوە، ڕۆژانە سەدان مێوان و دۆست و لایەنگر سەرمان لێ دەدەن... ئیتر مرۆڤ چۆن بتوانێت قسە نەکات، بەتایبەتیش کە بازاڕی سیاسەت گەرمە؟

ئەم (ڕۆژووی بێدەنگییە)، کە هەر بەخۆم ئەو ناوەم لێ نابوو، ٩ ڕۆژی خایاندبوو کە بڕیاردرا کۆمیتەی ناوەندی پارتی (ئەو کاتە ٢١ ئەندام بووین) کۆ ببێتەوە، لەژێر کەپرێکی شیوی نزیکی بارەگا دانیشتین، کۆبوونەوەکانی ئەو سەردەمەی ئێمە ٣-٤ ڕۆژ و شەوی دەخایاند. دوای دانانی خشتەی کۆبوونەوە بابەتەکانمان بەوردی و دووروودرێژی شی دەکردەوە.

وابزانم ڕۆژی دەهەمی (بێدەنگییە)کە بوو کە بڕیاری ڕاگرتنی شەڕی عێراق و ئێران درا، ئەوەبوو لە لایەنی ئێرانەوە پەیامێکی ئیمام خوێنرایەوە تێدا بەپەستی و بێزارییەوە ڕاگرتنی ڕاگەیاند، ئەو بڕیارەی ئەوەندە تاڵ و ناخۆش لە قەڵەم دا ناوی (ژار خواردنەوەی) لێنا، چونکە بەر لە ئەوە، چەندین جار ئێران بەڵێنی دابوو، تا مانەوەی سەدام حوسێن لەسەر حوکمی عێراق شەڕەکە ڕاناگرن، ئەوەتا بەناچاری شەڕەکەیان لەگەڵ ڕژێمی سەدام و بەمانەوەی سەدام، ڕاگرتووە.

بڕیاری ئاگر بەستی شەڕی عێراق و ئێران وەکو بۆمبی نەیترۆجینی لە کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندی تەقییەوە، چونکە دەزانرا کە هەرکاتێک ڕژێمی سەدام لەشەڕی عێراق ببێتەوە، ئەوە بەهەموو توانایەکەوە دێتە سەر گەلی کورد و بزووتنەوەکەی. جارێکی تر، دەشێلێت و تووشی زیانی گەورەی دەکات بەداخەوە هەروەهاشی لێ هات.

شەڕەکە لە ٨ی مانگی ئاب ١٩٨٨ ڕاوەستا، ئەوەبوو ڕژێمی سەدام، بەر لەوە، کارەساتی بوردومانی کیمیایی هەڵەبجەو زۆر جێگەی تر و تاوانی ئەنفالەکانی گەرمیان و تاوانگەلی جەرگبڕی دیکەی ئەنجام دابوو، تەنیا جێگەیەکی گرنگی موقاوەمەت لە کوردستان مابوو، دەڤەری بادینان بوو.

دوای ڕاگەیاندنی ئاگر وەستانی عێراق و ئێران، ڕژێمی بەعس بەرەبەیانی ١٩٨٨/٨/٢٥ ئەنفالەکەی لە بادینان دەست پێکرد کە نزیکەی هەفتەیەکی خایاند، لە (١٩) گوند و جێگە چەکی کیمیایی بەکارهێنا، نزیکەی (٢٥٠) هەزار هاووڵاتی لەو دەڤەرە دەژیان ئاوارەی سنوورەکانی تورکیا و ئێران بوون، ژمارەیەکیش کەوتنە دەستی لە شکری ڕژێم ئەم کارەساتە قوربانی گیانی و ماڵیی زۆری لێکەوتەوە.

خولاسە... هەندێ هەڤاڵ وایان دەزانی کە هەواڵی ڕاگرتنی شەڕەکە دەمهێنێتە قسە، لێ من بەهیچ شێوەیەک (خۆم بەدەستەوە نەدا) بێگومان

گوێم لە گفتوگۆو قسەکانیان بوو، هەندێ هەڤاڵ هەڵدەچوون ئەو بارودۆخە تازەیەیان لەلا قورس بوو، هەندێ نا ئومێد بوون، هەندێ هیوادار بوون، لە یادمە کە سەرۆک بارزانی گوتی: بەهەر نرخێک بێ ئێمە لەسەر موقاوەمەتی نیشتمانی خۆمان دەڕۆین، هەرچەندە لەبەر پێکهاتنی عێراق و ئێران هەلومەرجی خەباتمان دەگۆڕێت.

ئەزیش لەو باوەڕە بووم. لێ چاوم لە هەڤاڵان بوو کە هەندێکیان ئێجگار پەست و بێزاربوون.

ویستیان بمهێننە قسە تا بیروڕای خۆم دەربڕم، من شتێکم نووسی (بەنووسین قسەم دەکرد). دام بیخوێننەوە، کە ڕێگەیەکی دیکەمان نییە مەگەر لەسەر موقاوەمەت بڕۆین، هەرچی دەبێ بابێ...

... سێ چوار ساڵ بوو، چ لە ناو پارتی، یا لەناو حزبە عێراقییەکانی دیکە و، بگرە لەسەر ئاستی جیهانیشدا، گفتوگۆ لەسەر خاڵێک هەبوو:

ئایا شەڕی عێراق و ئێران بەمانەوەی سەدام لەسەر حوکم تەواو دەبێت، یا ئێران، وەکو ڕایگەیاندبوو، تا سەدام ماوە شەڕەکە ڕاناگرێت؟ من، لە مێژەوە بەو باوەڕە گەیشتبووم کە ئەم شەڕە، وەکو هەر شەڕێک، سنوورێکی هەیە و، مەرج و تین و توانای خۆی هەیە. هەر کاتێک بەبن بەست بگات ئیتر ڕادەوەستێ، چ سەدام بمێنێ یا نەمێنێ، هەمیشە لە ناو برادەران دەمگوت کە شەڕەکە لە ئەنجامدا، لەلایەنی خومێنییەوە و بەمانەوەی سەدامیش ڕادەگیرێت، چونکە تای تەرازووی هێزەکان بەجێگەیەک گەیشتووە هیچ کامەیان سەرناکەون.

ڕۆژی سێهەمی کۆبوونەوەکە، بڕیاریان دا من بەیاننامەیەک دەربارەی هەلومەرجی نوێی دوای ڕاگەیاندنی ئاگر بەست و ڕاوەستانی شەڕەکە بنووسم، دەبا ئەم بەیاننامە زوو بنووسم، تا لە کۆتایی کۆبوونەوەکە بیخوێننەوە و بڕیاری لەسەربدەن.

نیوەڕۆ، بێدەنگ، چوومە ژێر خێوەتێک، تەختەیەکی دارینەی بچووکم هێنا، چوارمشقی بۆی دانیشتم... بە(بێدەنگ) بەیاننامەیەکم نووسی... و باسی خەباتی ڕەوای گەلی کوردم کرد، کە بەشەڕی ئەو دوو وڵاتەوە نەبەستراوە، بەڵکو ئەو خەباتە دەیان ساڵە بەردەوامە، چ نێوانی عێراق و ئێران باش بووبێت یا خراپ... خەبات هەر بەردەوامیش دەبێت، تا بەدەست هێنانی مافە ڕەواکانی کوردو کوردستان...

بەو شێوەیە درێژەم پێدا، وابزانم چوار لاپەڕەی فولسکاب دەرچوو، تێدا بەپشتیوانی مێژووی خەبات و فیداکاری میللەتەکەمان، ورەمان بەخۆو بەخەڵک دەدا و داوای خۆڕاگری و موقاوەمەتمان دەکرد، کەوا«... لەژێر کەلاوە و خۆڵەمێشی وێرانی و کاولکارییەوە، نیشتمانێکی تازە دەبینم سەرهەڵدەداتەوە، نەوەیەکی نوێ دەبینم ڕادەپەڕێتەوە...» هتد! دێڕێکی ڕۆمانتیکیم، بەو مانایە، ئاخنیە تۆی بەیاننامەکە. دەقی دێڕەکە بەو جۆرە نییە، بەڵام بەو مانایە، کە هەرچەندە تووشی کارەسات و ماڵوێرانی بووینە، ئەوە ڕۆژێکی ڕووناکمان لەبەرچاوە، لەژێر هەورە ڕەشەکانەوە... هەڵدێ.

ڕەشنووسی بەیاننامەکەم بردەوە، خوێندیانەوە، دوای چەند گۆڕانکاری، بەگشتی پەسەندیان کرد، ئەو کاتە بوو کە (بێدەنگیم) شکاند.

ئەویش دوای (١١-١٢) ڕۆژ. ئەو ئەزموونەم لەلا زۆر گرنگ بوو، بۆخۆم، لەڕووی فیزیکی و دەروونییەوە ئارام و ئاسوودە و شادمان بووم. دوای ئەوە، زۆرجار هەوڵم داوە چەند ڕۆژێک بێدەنگ ببم و هیچی تر... لێ پێوەندیی کۆمەڵایەتی و هەلومەرجی کارو تێگەیشتنی دەوروبەرم ئەو دەرفەتەیان بەمن نەداوە، بەدەگمەن ڕۆژێکم لە ژیان، بەبێ دەنگی، پچڕاندووە.

گرفتی ئەم کۆمەڵگایە ئەوەیە، تۆ دەبێ هەمیشە قسە بکەیت، ئەگەر

لەسەر پڕوپووچترین شتیش بێت!! لێرەدا مرۆڤ ئازاد نییە، ئازادی تاکەکەس هەمیشە دەبێتە قوربانی و دەکەوێتە ژێر پێیان. لەوەیان زیاتر ناڵێم. ئەم هەموو قسانە بەبێ دەنگی دەنووسم، هەر بۆیەش دەتوانم چەندین ساڵ، بێ پسانەوە، لەسەری بڕۆم.

مرۆڤ هەرکە هاتە قسە ئیتر زنجیرەی بیرکردنەوەی دەپسێ... مەگەر چەند دێڕێکی بێ تام و بێ مانای خستبێتە سەرکاغەز، بیخوێنێتەوە، هەربۆیەش من لە خوێندنەوەی سەرکاغەز بێزارم...

*** کەی نووسەر دەبێ لە نووسین واز بهێنێ؟**

-چما مرۆڤ ئەگەر نووسەربێ، یا مانای بیرکردنەوە بزانێت، دەتوانێ لە نووسین وازبهێنێ؟ نووسین کە هەمان بیرکردنەوەیە، مەشقی هەمیشەیی ژیانە. لە ئەڵمانیا ئافرەتێکیان پێشان دام، ڕەنگە تەمەنی لە نەوەت ڕەت بووبێت، لە یانەی پەککەوتەکان دەژیا، لە جەنگی دووەمی جیهانیدا کەسوکاری لەلایەنی نازییەکانەوە گیرابوون و خرابوونە ئاگردانەوە سووتێنرابوون، باب و داک و خزم و برادەرانی تێچووبوون، ئایا دەزانی ئەو ئافرەتە لەو تەمەنەدا هەر دەینووسی؟ تۆ بڵێ: چی دەنووسی؟! هەموو شتێک، تەنانەت هەندێ جار لە گۆڤارو کتێبەکان بابەتی دەردەهێنا و دەینووسییەوە، یا یادداشت و بیرەوەریی خۆی... یا دەربارەی کەشوهەوا... یا نوکتەیەک، مەبەستیشی بڵاوکردنەوە نەبوو، بەڵکو تەنیا نووسین. دەیویست لە پرۆسەی نووسین ڕانەوەستێتەوە، گوتم: بپرسن، بۆچی دەنووسێت؟ گوتی: بۆ نووسین، چونکە نووسین بیرکردنەوەیە، نامەوێ لە مەشقی بیرکردنەوە واز بهێنم.

ئەگەر لە بیرکردنەوە کەوتم... ئیتر ژیانی من تەواو، مێشکم دەبێ لە کارنەکەوێت، گەرنا دەمرم، مردنم... لە کارکەوتنی مێشکمدایە.

* ئایا شیعرت نووسیوە؟

بەڵێ: شیعرم بەکوردی، بەشێوەی کلاسیکی ئەزموون کردووە، هەروەها پەخشانی هونەری، کە بە(شیعری ئازاد)ی ناو دەبەن، هەندێ پارچە شیعرم بڵاوبوونەتەوە چ بەکوردی یا عەرەبی، بەڵام زۆر زوو تێگەیشتم کە ناتوانم ببم بەشاعیر، هەربۆیەش زوو دەستم لە شیعر هۆنینەوە هەڵگرتووە.

ئاسوودە بووم لەو خولیایەی کە ناتوانم بیبەمە سەر. من زوو خۆم لە هەر کارێکدا بێ، تاقی دەکەمەوە، ئەگەر بزانم دەرەقەتی نایەم زوو دەکشێمەوە. خۆم بەشتێکەوە ماندوو ناکەم کە بزانم تێدا سەرناکەوم. هیچ کاتێکیش پەشیمان نابمەوە. لەوەی کە لەم کارە یا لە ئەوی تر واز دەهێنم، زوو لەبیری خۆمی دەبەمەوە...

* قەت گۆرانیت وتووە؟

بۆ خۆم، لەبەر خۆمەوە، بەڵێ! بەڵام لەناو خەڵکا... نەخێر! مەگەر لە منداڵیدا، سەردەمی قوتابخانەی سەرەتایی، هەندێ جار لەنێو خۆمان پێشبرکێی گۆرانی و سرودمان هەبووە، گوتنەوەی ئاواز و ئاهەنگی گۆرانی پێویستە بۆ ڕۆح و جەستە، زۆرجار لەبەر خۆمەوە، یا لە(دەروونەوە) بەبێ دەنگ، هەندێ ئاواز دەڵێمەوە... بەتایبەتی هی فۆلکلۆری، یاهی گۆرانیبێژەکان، ئاواز و ڕیتم و گۆرانی و...و... بەگشتی (لەرینەوەی مۆسیقییانەی دەروونی) بەلای منەوە زۆر پێویستە... وەکو دەرمانە بۆ ڕێکخستنەوەی هاوئاهەنگیی دەروونی ئینسان ناتوانم لێت قبووڵ بکەم کە ئینسانێک هەیە نە ئاوازێک دەزانێ، نە بۆ خۆی گۆرانییەک دەبێژێ، نەگوێی لە مۆسیقایەک دەگرێت...

ئینسانی وەها هەیە؟! چ ئینسانێکە؟! لەخۆچووندایە، واتە: ئەوەندە، لەخۆ بەئاگا بیت، تا لەخۆت دەچیتەوە، بۆ نموونە: ئەگەر (عود) ژەن بیت، بۆ داهێنان بەو ئاستە بگەیت، کە ئیتر لەکاتی ژەنیندا دەست و پەنجەکانت

خۆبەخۆ تەلەکان بلەرێننەوە، نەک بەویست و ئارەزووی هۆشیارانەی خۆت بێت. یا ئەگەر لە هونەرێکی نووسیندا دەچێتە ناو جەرگەی بابەتەکەوە بەجۆرێک بنووسێت کە ئیتر ئەوە قەڵەمەکەیە بەخۆی دەنووسی و دەڕوا، پەنجەکانت تەنیا ئەرکی ڕاگرتنی قەڵەمەکەیان پێیە و... تۆ ئیتر وەکو بڵێی لەوپەڕی ناهۆشیاریدای، تەنیا قەڵەمەکەت بەخۆی دەڕوات، یا پەنجەکانتە تایپ دەکەن... تۆی و تۆ نیت، خۆتی و خۆت نیت. لەخۆ چوویتە، لە هەمان ئاگاداریی ڕۆشنیدا، ئەوەی بەزەینتدا دێ لە نووکی خامەوە، وەکو کانیاو، بڵق دەدا و دەڕوات.

لە زانستەکانیشدا هەمان شێوەی داهێنانە، لەگەڵ جیاوازیی ئامرازی بیرکردنەوەدا. تۆ کە لە خولیای دۆزینەوەی هۆی یا ئەنجامی دیاردەیەکی سروشتی، پیشەسازی، پزیشکی، کیمیایی یا فیزیایی و جیولوجی و هی تردا دەکەویتە قووڵایی بیرکردنەوە و لێکدانەوە، دەبێ ئەوەندە بڕۆیت تا بەپلەی (لەخۆداچوونەوە) بگەیت، هەروەکو ئەوەی لە نووستندای. نازانیت هەی یا نیی. لەو دەمەدایە کە بریسکی دۆزینەوەیەک لێ دەدات، زەین ڕۆشن دەکاتەوە و... شتێکی تازە فێر دەبیت، یا دەزانیت.

وزەی مێشکی مرۆڤ جیهانێکی بێ سنوورو بێ هاوتایە هەرچەندە پتر بیخەیتە کار، هێشتا پێی باشترەو، بەهێزتر دەبێت، عەقلی مرۆڤ هەمیشە لە خزمەتایە، بەڵام ئێمە نایناسین، نایبینین، خۆماندوو ناکەین، هەمیشە بەدووی حاڵەتی تەمەڵی و خلیچک و خاوی و«ئیستراحەتی» درۆزنانەی جەستە و دەرووندا دەگەڕێین، شتە گەوهەرییەکانی وجود لەبیر دەبەینەوە.

* تا چەند لە خۆت ڕازیی؟

زەحمەتە بڵێم... چەند! بەگشتی ڕازیم بەوەی کە من لەو هەلومەرجەدا، کە ژیانی پێک هێناوم، هەر ئەوەم لێ دەردەچوو، ڕەنگە هەندێ جار،

بەهەڵە، بکەومە داوی (خۆزگە) و (ئەگەر) و شتی وەها. لێ بەناپەسەندی دەزانم ئەگەر مرۆڤ ژیانی خۆی بە(خۆزگە) و (ئەگەر) بەسەر ببات، باشترە لەگەڵ خۆی بسازێت، لەگەڵ ئەو هەلومەرجەی بۆی ڕەخساوە بگونجێت، چونکە ناتوانێ بەئاسانی هەلومەرجی دیکە بخولقێنێ، ئەگەر نا هەردوولای لە کیس دەچێت و، وەختی تەمەنی بەفیڕۆ دەڕوات.

بیرۆکەی (خۆزگە) نە(ئەمت) بۆ دەهێڵێتەوە، نە(ئەوت) بەدەست دێنێ. کەواتە، بەگشتی، ڕازیم... ئەگەر ڕەخنەم لەخۆم هەبێت، زیاتر لەوەیە، هەندێ جار (وەخت) بەخۆڕایی لە دەستمان دەردەچێت، شتی پڕوپووچ وەختمان دەگرێت، ئەگەر بڵێی بەمن: ئەی باشترین شێوەی بەسەربردنی (وەخت) چییە؟ دەڵێم: ئەوەیە شتێک فێر بی، شتێکی نوێ بزانیت، لەخۆ بەئاگا بی. لەگەڵ یەکێکا گفتوگۆ بکەیت کە دەرگای ڕۆح دەکاتەوە، نەک دەرو پەنجەرەی دەروونت دادەخات و، وزەی هۆش و هەستت دەکوژێنیتەوە.

ئینسانی زیندوو ئەوەیە کە هەمیشە... وزەی ناوەوەی خۆی بەوزەی گەردوونییەوە گرێ دابێت، واتە: ئاگای لەخۆ بێت، ئاگای لە گەردوون بێت، گەرنا، ئەگەر لەو وزە گەردوونییە پچڕا... بزانە کە ون بووە، خۆی لە دەس داوە.

*** لەگەڵ ڕەخنەدا چۆنی؟**

بەدرێژایی وەڵامەکانی پێشوودا، لێرەو لەوێ، ڕەخنەم لەخۆ گرتووە.

ڕەخنەیەک، ئەگەر هەبێ و نەمگوتووە، ئەوەیە، کە بۆچی درەنگ بەهەندێ ڕاستی گەیشتووم؟ ئایا نەدەبوو زووتر با؟ یا... گەیشتن بەڕاستییەکانی ژیانیش، وەکو هەر شتێک، هەلومەرجی خۆی هەیە؟ هەر شتێک وەختی خۆی هەیە؟ پرسیاری سەختی جارانم ئەوەبوو: بۆچی لێرەم؟ بۆچی دەژێم؟ بۆ کوێ دەڕۆم؟ ئەم گەردوونە چییە؟ ئەم خەڵکە بەرەو کوێ دەڕۆن؟

تازە بەتازە سەرەوتوومە، ئۆقرەم گرتووە... هەربۆیەش ڕەخنەم کەم بووەتەوە، بەڵکو دەچێ ڕەخنەم نەمێنێ، تەماشای نووسین و قسەی ڕۆژانەی سیاسییانەم مەکەن، زۆربەی پڕوپووچ و بۆ وەخت بەسەربردنە، گرنگ لە ناخی دەرووندایە... لەوێدا بەرەو لەنگەرگرتن و ئارام بوونەوە دەڕۆم.

*** بەنەوەی نوێ، چی دەڵێی؟**

نەوەی نوێ؟... بەکورتی سێ بیرۆکەم هەیە:

١- جیاوازی لە نێوانی تەمەنی من و نەوەی من لەسەرێک و، تەمەنی نەوەی نوێ لە سەرێکی دیکەوە نزیکەی (٢-٣) هەزار ساڵە، بەڵکو پتر. ئەمەش لە ڕووی جیاوازی (تەکنۆلۆژیای) ژیانی ڕۆژانە و چەمک و بیروبۆچوونەوە دەڵێم. من لەو نەوەیەم کە زۆربەیان بەکەرەستە و ئامرازو تەکنۆلۆژیای چاخی بەردین و چاخی کشتوکاڵ دەژیان: قا و چەخماغ، کەوچکی دار، قاب و ئینجانەی قوڕی سوورەوەکراو، کەندوو هەمان و مەشکەو جەوەنە، داس و قەیناغ، هاتوچۆ بەپێ یا بەوڵاخ، جەنجەڕو شەن و کەو، بێ کارەبایی، دەمێکی زۆری ژیانمان نە ڕادیۆمان هەبووە، نە تەلەفزیۆن، نە سینەما... ئەوە کۆمپیوتەر و ئینتەرنێت و موبایل و فڕۆکە و... هەر هیچ! من خۆم بەزیندەوەرێک دەزانم نیوەی لەشم لەناو ئەشکەوتایە، لەتاریکیدایە، بەپێ و دەستی پەتی... نیوەکەی دیکەی لەشم کەوتووەتە بەر ڕۆشنایی کارەبا و داهێنانە سەیرو سەمەرەکانی ئەم سەردەمە. نیوەی یەکەمی ژیان و تەمەن و لەشم لە سەردەمی (٢-٣) هەزار ساڵ بەر لە ئێستا بەسەربردووە... ئێستا کە بەحاڵ چاو دەکەمەوە، دەبینم کە لە دونیایەکی ئێجگار جیاواز دام.

نەوەی نوێ یەکسەر لە چاخە هەرە تازەکەدا چاو دەکاتەوە... هەر بۆیەش بەزەحمەت لێی دەگەم... ئەویش لەمن هەر تێناگات! من بەڵکو هەوڵێک

بدەم، بەڵام ئیتر درەنگە بۆی... بەڵام، ئەو پێویستی نەماوە لەمن تێبگات، چونکە هیچ هەلومەرجێکی ژیانی من، ئێتر بۆ ئەو، سوودی نەماوە.

نازانم... من چۆن و چی بڵـــێم بەنەوەی نوێ؟ بەڕاســـتی ناتوانم، نە ئامـۆژگـاریی بکەم، نە ڕێنومـایی... تەنیـا ئەوەندە نەبێ، بڵـێم: من وەها ژیام... نیـشـتـمـانـێکت هەیە، من ئەوەندەم پێ کـراوە بۆی، تۆش خـۆت و ویژدانت هەوڵێک بدە. خـۆت لە نیـشـتـمـانـەکـەتا پێبگەیەنە، ڕەنگە لە چەمکی (نیشتمان و گەل)یشدا وەکو یەک بیرنەکەینەوە.

٢- بەخـۆمان نەوەی نوێ فـێری مافـەکانیـان دەکەین، ئەو مـافانەی کە تا دوێنێ نەماندەزانی چییە، ئەو مافانەی کە بەخـۆمان نەمانبووە...

مافی مرۆڤ، مافی منداڵ، مافی دایک، مافی ئازادیی دەربڕین و گشت ئازادییـەکـان... ئێـسـتـا ئەگەر نەوەی نوێ، بەپێی پێـوەری مـافی مـرۆڤ و مـافـەکـانی تر، ئێـمـەی نەوەی کـۆن، بدەنە دادگـا... کـەسـمـان بەبێ سـزا دەرناچین، چونکە ئێمە ڕێزمـان لە هیچ یەک لەومـافـانە نەگـرتووە. یەکەم، لەبەر ئەوەی نەمانزانیـون، دووەم، ئەگەر بەتیۆری (لەم دواییـیە) ئاگاداریان بووبین... لێ نەمانتوانیـوە بەرجەستەیان بکەین، یا نەمانویستوە! کەوابێ... ئەگـەر نەوەی نـوێ، بەپێـوەری تێـگەیشـتـنی ئێـسـتـای خـۆی، هەڵـمـان بسـەنگێنێت، ئەوە دەعـبـای سـەیرمـان لێ دەردەچێت، سـتـەمـکارو سەرکوتکەری گشت ئەومافانەین کە لەچەرخی بیستەمدا بۆ مرۆڤ و گەلان پەسەند کراون، تاوانبار دەردەچین...

مـەگـەر نەوەی نوێ، بەمـەزنێـتی خـۆی، بمانبـەخـشـێت. کـەواتە ئـەگـەر ئامـۆژگـارییـەکم بۆ ئەم نەوە نـوێیـە هەبێت، ئەوەیە: پێـوەری پابەندبوون و بەرجەسـتـەکردنی مـافـەکـانی تاک و کـۆمەڵ بـەسـەر نەوەی کـۆندا جێـبـەجێ مەکەن... گەرنا باب و داک و مام و خاڵ و پوورو پوورزاو خزم و کەسوکاری هیچ کـامـەتان بەسـەلامـەتی دەربازنابن، هەمـوو تاوانبـار دەردەچن... نەک

لەبەر ئەوەی وەهایان ویستووە، بەڵکو لەوە زیاتریان نەزانیوە و، لەوەش زیاتریان بەڕاست و دروست نەناسیوە!.

کەواتە: نەوەی نوێ بەخۆیان دەزانن چ ژیانێک بخولقێنن، بێگومان ژیانیان وەکو هی ئێمە نابێت، ناشتوانم بڵێم، وەکو ئێمە بن، بەڵکو دەبێ بەخۆیان ڕێگەی خۆیان بدۆزنەوە.

* کەرکووک، چی؟

-کەرکووک، دیمەنێکی ڕۆشن و پاکی ڕۆژانی بەهار و، ئاسمانی سافی شەوانی هاوینە، لەو سەردەمەی (١٩٥٧-١٩٦١) تێدا تازە پێدەگەیشتم کەرکووک بەهەشت بوو، خاوێن و ڕازاوە. وەهام دەهاتە بەرچاو، هەر چیم هەیە لەو کاتەوە، لە ژیانما تۆی چاندراوە، لەوێوە دەستم بەم گەشتەکردووە. کەرکووک باوەشی بۆ دەکردمەوە. منی تینووی زانین و فڕین بەرەو ئاسۆی دوورتر... چ قوتابخانە یا برادەران، یا داب و نەریتی کۆمەلایەتی و دۆستایەتی ئەو وەختە... هەموو فوویان بەبادەوانی (ئایدیالی) بەرزەفڕدا دەکرد...

ئێستا وێران بووە. ئەو کەرکووکەم لێ ون بووە، ئەو کەرکووکە جوانە تەنیا لە بیرەوەریمدا ماوە. ئێستا کەلاوەیە، تووشی دەسدرێژی بووە، ئابڕوویان تکاندووە... کە تەماشای ئەکەم شەرم دامدەگرێت، لێ بەشێکی گرنگی بیرو هەستم هەر لەوێدایە؛ کەرکووکم بەکۆڵەوەیە، جاران ئەو هەڵیدەگرتم، نازی دەکێشام. ئێستا من هەوڵ دەدەم دڵی بدەمەوە، ناتوانم بەجێی بهێڵم... پارچەیەکی گەشی ژیانم لەوێدایە، لەوێ شین و گەشە، دەمەوێ لەوێ نەکوژێمەوە، هەرچەندە شارەکە خامۆش و تاریک و خەمبارە.

* ڕاستە بڕوات بە(پوول) نییە؟

- بڕوام بەهێـــزی پوول هەیە، پوول بنەمـــایەکی پێـــوەندییـــە کۆمەڵایەتییەکانەو، خوێنی جەستەی ژیانی ئابوورییە، کەس نییە لە هێزو توانای کۆمەڵایەتی پوول تێنەگات، تۆبڵێی: من چیم لە پوول دەوێ؟!... پولم بۆ پوول نەویستووە (ئەمەش لەڕووی ئابوورییەوە دروست نییە)، هەوڵم داوە نەبمە دیلی پوول لێ دێوی پوول دەسبەردارمان نییە، چونکە پوول ئەو شمڵە شەڕەیە کە ناچار دەبین لەگەڵیدا بسازێین، ئەگەریش بەپوول کاری چاک ئەنجام بدەیت، ئەوە پوول دەبێتە خزمەتکارت و دەرگای بەهەشتت بۆدەکاتەوە (مەبەستم: بەهەشتی ئاسوودەیی ویژدانە).

* چ کاتێک تووڕە دەبی؟

- من کەم تووڕە دەبم. وەکو هەرکەسێک لەوکاتە تووڕە دەبم کە شتێک بەدڵم نەبێت، ئەمە خەسڵەتێکی سروشتی ئینسانە، بەڵام چیم بەدڵ نابێ و تورەم دەکات؟ نازانم... چونکە ئەو حاڵەتە لەگەڵ ڕۆژگار و تێگەیشتن لە مەسەلەکان دەگۆڕێت. ڕەنگە ئێستا لە زۆر شت تووڕە نابم، لەوانەی کە بەر لە ئێستا تووڕەیان دەکردم.

* چ کاتێک هەست بەنامۆبوونی خۆت دەکەی؟

- لەکاتی (لەخۆ بێ ئاگایی)دا ئەو وەختەی لەبیرم بچێتەوە من کێم و بۆچی هاتوومە و، بەرەوکوێ دەچم، ئەوکاتەیە (نامۆیی) و بەدبەختی من. لە هیچ شارو وڵاتێکی دونیادا هەستم بەغوربەت و نامۆیی نەکردووە، مەگەر ئەو کاتانەی کە خۆم لەبیر بچێتەوە. جاری وەهاش هەبووە لە ناوماڵ و لەناو دۆست و برادەرو، لە نیشتمانی خۆمدا، لە زیندانی کاری نامۆییدا ژیاوم.

کەسانێک هەن بەزۆر دەیانەوێ بەخۆیان بسەلمێنن کە (نامۆن، یا وەها

پیشـــان دەدەن، من خـۆم فـریو نادەم. خـۆم بەدەســتی شـتی دەسکرد و ڕواڵەتییەوە نادەم، جاری وەها هەیە دۆخی (نامۆیی) توند یەخەم دەگرێ: نازانم لەکوێم و چی دەکـەم و بۆچی دەبێ ئەوەبکەم یانەکـەم، بۆچی دەبێ پابەندی ئێرە یا ئەوێ ببم، یادیلی ئەم چەمکە و ئەو چەمکەببم... هتد! لێ حەزناکەم ئەم دۆخەیە بەردەوام ببێت، هەمیشە هەوڵم داوە، دوورە نامـۆیی ببم و بگەڕێمەوە زێدو ماوای ڕۆحی خۆم.

*** نامۆ بوون چ مانایەک دەدا؟ کەی هەست بە(ئیغتراب) دەکەی؟**

- هەســـتی نامـــۆیی، یا بێگانەگی، بەلای منەوە، لە هەســـتـــە بنەڕەتییەکانە، کە هەر مرۆڤێک لە کاتێکدا، کەم یا زۆر، دادەگرێت. هەندێ کەس دەیکات بەخولیایەک کە تا سنووری دێوانەیی دەیبا. لە لای هەندێ کەسی دیکە چرکەیەکە یا پەلاچەیەکە دێت و دەکوژێتەوە.

نامۆ بوون، یا هەست بەغەریبایەتی لەم جیهانەدا، بەشێکە لە سروشتی بوون، لە سـروشـتی بیرکـردنەوە و ژیان. کـەم کـەس هەیە، چ ژن یا پیـاو، گـچکە یا گـەورە، نەخـوێنەوار یا خـوێنەوار، جـارێک یا چەند جـار (یا بۆمـاوەیەکی زیاد) لە ژیانیـا لە خـۆی نەپرسێت: من کێـم؟ ئەم گـەردوونە چییە کە منی تێدا هاوێژراوم؟ لە کـوێوە بۆ کوێ؟ بۆچی مـان و نەمـان و مردن؟ دوای ئەوە چی؟ بۆچی ژیان و بوون وەهایە کە هەیە؟ وە... ئـەم جۆرە پرسـیـارانە بنیـادەم دەخـاتەوە بەر چەندین ڕێگەی هەڵبـژاردن: یا ڕوو لە بێـبـاکی و لاساری دەکـا، یا دەشـڵـەژێ و دەترسێ و قـووڵتـر بەخـۆیا دەچێتەوە، وەیا خامۆش و بێدەنگ خۆی بەدەستی مان و بوونەوە دەدات و دەڵێ: کەواتە، وەهایە کە هەیە. وەهابووە و وەها دەبێ، بەرامبەر بەگەڕانی چەرخی ئەم گەردوونە چارەمان نییە... چی دەبێ با ببێت. بەدەستی (جان پۆل سـارتەر)ی فەیلەسووفی فـەرەنسی و هاوبیـرانی (هەروەها بیردۆزانی بەر لە ئەو و دوای ئەو) پرسـیـارە گـەردوونیـیـەکـانی نامـۆ بوون شـێوەی

فەلسەفەی (وجود)ییان وەرگرت، کە لە سنووری بوون و نەبوون، لە سنووری نامۆیی لە بوون و ئازادی و شڵەژان و ترس و دڵەڕاوکێ و بێ قەراری لە ئاستی مردن، دەکۆڵێتەوە. ئەو دەیگوت کە مرۆڤ بێ پەنایە لەم جیهانەدا بەخۆی لە ژیانی خۆی و لە هەڵبژاردندا ئازادە. بەرپرسیارە لەم ئازادییە، ئازادە چۆنی بەکار دێنێ. کەواتە ئازادی بەرپرسیارێتییە و...هتد. ئەوە لایەنە فیکرییەکەی لە سەدەی بیستەمدا. بەڵام لە لای من، هەست بەنامۆیی (بیر) نییە، بەڵکو شێوەیەکی بیرکردنەوەیە. هەر بۆیەش ئەگەر بەشێوەی (سارتەر) و هاوبیرانی بیربکەیتەوە، ناتوانی قاڵبێکی ئەیدیۆلۆجی سنووردار بۆ بیری خۆت دابڕێژیت، چونکە پرسیارە وجودییەکان ئەیدیۆلۆجی، یا فەلسەفەیەکی سنووردار نین، بەڵکو پرسیاری ڕەهای (بوون) و گەردوونن. هەر بوونە و هەر دەمێنن. واتە: هەزاران ساڵ بەر لە (سارتەر) ئەو پرسیارانە (مەبەست پرسیارەکانی هەست بەنامۆیی) بەشێوەی جۆربەجۆر لە زەین و دەروونی ئینساندا سەریان هەڵداوە. تەنانەت لە شیعر و ئەدەبیاتیشدا نوێندراون. بۆ نموونە، فەرهەنگی کوردی و ڕۆژهەڵات بەگشتی پڕ لەو پرسیارە ئەزەلییانەیە. بۆنزیک خستنەوەی مانای نامۆ بوون دوو وێنەی شیعری دێنمەوە:

یەک: (باوە تایەری هەمەدانی) کورد زمانی خۆمان شیعرەکە بەسۆرانی لە داڕشتنەوەی دلزاری شاعیر لە (گەنجینە)کەیدا دێنمەوە، دەڵێ:

سەرێکم هەیە و سامانی نییە
غەمێکم هەیە و پایانی نییە
گەر بڕوا ناکەی وەرە ببینە
ئەو دەردە کەوا دەرمانی نییە

(دەردە)کەی چییە کە بێ دەرمانە؟ دەردی لە خۆپرسینەوەیە کە ئەم هاتوچۆیە، بەتۆنێلی گەردوونا، یانی چی؟ هەمان هەستی نامۆ بوونە.

ئەگەر چەند چوارییەکی دیکەی باوە (بابا) تایەر هەمەدانی بخوێنینەوە، ئەو مانایەمان لە لا ڕوونتر دەبێتەوە.

دەفەرمێت:

غەریبی ناخۆش کە دڵگیرمە
فەلەک هۆی ملی بەزنجیرمە
فەلەک لە ملما زنجیر دەرێنە
کە خاکی غوربەت دامەن گیرمە

لێرەدا (غوربەت/ نامۆ بوون لەم گەردوونەدا) زنجیرێکە کراوەتە ملی، خۆی هۆی نامۆبییە. ئەو غوربەتەی لێ نابێتەوە مەگەر زنجیرەی فەلەک لە ملی دابکەنرێت. هەروەها دەڵێت:

عەزیزان مەوسمی جۆش بەهارە
چەمەن پڕ سەوزە، سەحرا لالەزارە
دەمێ لەم وەرزەدا دەرفەت بەسەرخە
کەوا دنیای دەنێ بێ ئیعتبارە

(باوە تایەر)، لێرەدا، لە بنی مەنجەڵی هیچگەری و عەبەسییەت و عەدەمییەت (نەهلیستی) دەدات، هەزار ساڵ بەر لە سارتەر.

یا دەڵێت:

دەبێژن کە بۆچی بێ قەراری
مەگەر پەروەردەیی بایی بەهاری
لە بۆ چێ وێڵی کێو و دەشت و سەحرای
بە گیانت نیمە تاوی ئیختیاری

* کەوا بێ ئەمە بێ قەرار بین؟

- ئەم (بێ قەراری)یە هەمان بێ قەراری و دڵەڕاوکێی وجودییەکەی سارتەرە. هەروەها (وێڵ) بوون لە هەستی نامۆبییەوە هاتووە و (ئیختیاری) لە دەست دەرچووە. ببینە چۆن ئەم (ئیختیار)ە بەکار دێنێ، چ ناسک و ورد و قووڵ، واتە: (مافی) ئیختیاری (هەڵبژاردن)ی هەیە بەڵام (ناتوانێ) بەکاری بهێنێت. ئازادە و ئازاد نییە.

لە چوارینەیەکی دیکەدا باوە تایەر دیدی لەمەڕ بێ قەراری و بێدەسەڵاتی لەئاستی مردن و، سنووری مان و نەمان، بەم شێوەیە دەهۆنێتەوە:

درەختی غەم لە گیان کردوویە ڕیشە
لە دەرگەی خوا دەناڵێنم هەمیشە
عەزیزان با بزانین قەدری یەکتر
ئەجەل وەک بەردە ئینسان چەشنی شیشە

ئەم (قەدری یەکتر زانینە) هەمان هەست بەلێپرسراوەتییە بەرامبەر بەماف و ئازادیی ئینسان کە (سارتەر و هاوبیرانی) دەیلێن. تۆ وەختێک ئازادی کە ئازادیی خەڵکی تر دەپارێزیت. هەر بۆیەش سارتەر بەخۆی دەچووە خۆ پیشاندانەکانی پاریس لە پێناو ئازادی تاک و کۆمەڵ، لە پێناو ڕزگاریی گەلی ژێر دەست و گیراوە سیاسییەکانی وڵاتە گیرۆدەکان بەدەستی دیکتاتۆریەت و ستەمەوە.

باوە تایەر دەڵێت:

دڵم زار و حەزینە چۆن نەناڵم
وجودم ئاگرینە چۆن نەناڵم
دەبێژن پێم کە چۆن و چەند دەناڵی
کە مەرگم لە کەمینە چۆن نەناڵم

ئەمجا دەڵێت:

لەشی مەینەت کەشم (مەینەتکێشم) هەس ئەی خودایە
دڵێ حەسرەت کەشم (حەسرەتکێشم) هەس ئەی خودایە
لە تاوی مەفتەن و دادی غەریبی
لە سینە ئاتەشم (ئاگرم) هەس ئەی خودایە

(غەریبی) بابە تایەر لەوەوە نەهاتووە کە دوور وڵات بووە و ئاوارە کراوە.

نامۆ بوون، لێرەدا، مانای جوغرافیایی نییە. ژیانی باوە تایەر، وەکو مێژوو دەیگێڕێتەوە، هەر لە جێگە و زێدی خۆی لە هەمەدان بەسەر چووە. کەواتە نامۆ بوونی ئەو لە هەست و دەروونەوەیە، لە بیر کردنەوەی وجودیی خۆیەتی، کەبەرەو (ئەودیو) باڵی هاویشتووە، ویستوویەتی بزانێت کە چی لەوێ هەیە. ئەو ئازادی ویستووە دەڵێت:

لە دەس چاو و لە دەس دڵ هەر دوو فریاد
کە چاو هەرچی ببینێ دڵ دەکا یاد
دەکەم من خەنجەرێ نووکی لە پۆڵاد
ئیتر دەیدەم لە چاو تا دڵ بێ ئازاد

شاعیرێکی دیکە بەم قووڵییە بۆی نەچووە. لە ڕووی فیزیکییەوە ئەسڵێکی بنەڕەتیی ماریفەت (مەعریفە) دێنێتەوە، کە (دڵ) یا (زەین) لە ڕێگای هەستەوەرەکانەوە (لێرەدا چاوە) بەماریفەت و زانستی دەگات. بەڵام باوە تایەر دەیەوێ لەم ماریفەتە ئازاد بێ و بەئازادی ببینێت (بیر بکاتەوە)، ئەویش ئەوەیە کە دڵی یا زەینی، لە وێنەکانی گەردوون و بوون ئازاد ببێت، تا لە جیهانی ڕەهاییدا ئازادانە بمێنێتەوە. ئەو ئازادیی خۆی لە نەماندا (نەمانی دیدی فیزیکیدا) دەبینێتەوە.

ئەوە چەند نموونە لە باوە تایەری هەمەدانی.

دوو: ناڵەی جودابی هێمنی شاعیر لە شیعرێکی جەلالەدینی ڕۆمی وەرگیراوە کە بەر لە (٦٠٠) ساڵ ژیاوە، لە (بەڵخ)ی ئەفغانستان لە دایک بووە و لە(قۆنیە)ی ئێستایی تورکیا کۆچی دوایی کردووە. جەلالەدینی ڕۆمی دەڵێت: (بە پەخشان ماناکەی دێنمەوە) لەو شمشاڵە گوێبگرە، چی دەڵێت؟ ئەو ناڵە و فریادیەتی، گلەیی و شکایەتی لەوەیە کە لە ئەسڵی خۆی جودا کراوەتەوە، ئەو شمشاڵە (یا سۆز و ناڵەی ئەو شمشاڵە) دەڵێت کە هەر شتێک بۆ ئەسڵی ڕەسەنی خۆی دەگرێ. هەرشتێک دەیەوێ بەئەسڵی خۆی شادببێتەوە.

وەک دەزانن، شمشاڵ لە قامیشە. ئەو تەڵە قامیشە کە براوە و کراوە بەشمشاڵ دەگرێ بۆ قامیشەڵان. کە بۆ چی لێی جودا کراوەتەوە؟ ئەمەیە کە هێمن ناوی (ناڵەی جودایی) لێ ناوە. (کە بۆ جودایی لە خاکی نیشتمانی بەکار هێناوە)، بەڵام جەلالەدین، بەر لە ٦٠٠ ساڵ، ناڵەی جودایی قامیشی شمشاڵی بۆ نامۆ بوونی ڕۆح بەکار بردووە. ئەو دەڵێت کە ئینسان ڕۆحە، یا پارچەیەکی ڕۆحی تێدایە، کە بەشێکە لە ڕۆحی گشتی، ڕۆحی گەورەی گەردوون، زەڕەیەکە لە خوا... ڕۆحی ئینسان لەم جیهانە خاکییەدا (لە ئەمدیو) نامۆیە، هەمیشە هەست بەنامۆیی دەکات و، لە شەوقی ئەوەدایە بگەڕێتەوە ئەسڵی خۆی، بەزەریای گەورەی ڕۆحی گەردوونی تێکەڵاو ببێتەوە،وەکو ئەو تەڵە قامیشە کە دەیەوێ بگەڕێتەوە قامیشەڵان. ڕۆحی (ئەمدیو) هاوڕازو هاوتای لە (ئەودیو) هەیە.

* کەواتە؟

- کەواتە هەستی نامۆبوون هەر هەبووە و هەیە، بەشێکی ڕەسەنی سروشتی خۆرسکی مرۆڤە. بەخۆی دێ و پەیدا دەبێ. دەسکرد نییە و، بەئارەزوو نایەت، بەڵکو هەیە بەمەرجێک تۆ بهێڵی بەشێوەیەکی خۆرسکانە، لە دەروون و زەیندا بخولقێ. من ڕەخنەم لە هەندێ کەسە، کە

هەوڵ دەدەن بەشێوەیەکی دەسکرد، حاڵەتی نامۆ بوون دەرببڕن، تا پیشانی نامۆیی بدەن بێ ئەوەی بەدۆخی دروستی نامۆ بوونی ڕۆحی گەیشتبن. من بۆچی لە نامۆیی ڕزگارم بووە؟ ئەمە پرسیارێکە ناتوانم وەڵامی بدەمەوە.

* کەوابێت نامۆیی چییە؟

- ئەوە بیرکردنەوەی (نامۆیی) بەگشتییە... کە چۆن ئادەمیزاد، وەختێک لەسارای ئەم گەردوونەدا هەست بەتەنیایی دەکات، هەستی نامۆیی ڕۆحی دایدەگرێت.

(نالی)ی شاعیر دەڵێت:

لەم شەرحی دەردی غوربەتە، لەم سۆزی هجرەتە
دڵ ڕەنگە بێ بەئاو و بەچاوا بکا عبوور

ئیمڕۆ کۆمەڵگەی بەشەری لە زەمەنی نامۆیی (غوربەت)دا دەژێ، باری جیهانگەری دۆخی نامۆیی فراوانترو قووڵتر کردووە، ئیمڕۆ جیهانی فرە کەلتووریی، پێوەندیی بەربڵاوی چڕو، تەکنولۆژیا و زانست و شۆڕشی زانیاری هیچ شتێکی کۆنی وەکو خۆی نەهێشتووە، سنووری تاپۆ و پیرۆزمەندەکان تێکشکاون، شت وەکو جاران لەسەر بنجی ڕەسەنی خۆی نارۆیت، لە دابونەریت و جلوبەرگ و شێوەی خواردنەوە و ئامرازی جۆربەجۆری ژیانی ڕۆژانە بگرە، تا بیر و بۆچوون و جیهانبینی... لە گۆڕانکاریدان.

کەوابێ، زەمەنی غوربەت تا دێ زاڵتر دەبێ، تەنانەت هەندێ بیردۆزو لێکۆڵەوەر بەزەمەنی (بیژی) و زۆڵایەتی ناوی دەبەن، ئەمەش لەڕووی ئەوەوە کە تۆ شتێک دەچێنی شتێکی دیکەی لێ دەڕوێ، هەوڵ دەدەین منداڵان بەرێبازێک پەروەردە بێن بەشێوەیەکی دیکە دەردەچن... مرۆڤ نامۆیە لە ئاست کارو چالاکی و بەرهەمهێنانی خۆی... هتد! وشەی (نامۆ) لە فەرهەنگی کوردیدا بەچەند مانا دێ، وەکو: بێگانە، غەریبە، غەوارە

(خەواره)، هۆگر نەگرتوو، نەبان، مشەخت، ئاوارەبوون، دووركەوتنەوە لە نیشتمان... هتد!.

(خەواره) لە دەشتی كەركووك بەئەو مەڕە دەڵێن كە وێڵ دەبێ لە مێگەلەكەی (ڕانەكەی) جیادەبێتەوە و دەچێتە ناو مێگەلێكی دیكەوە.

بەفارسی بەرامبەر بەوشەی نامۆ وشەی (بێگانەگی) دێت، هەروەها بەمانای (نائاشنایی) و (ناخزمایەتی)...

بەهەر مانایەک وەری بگریت (نامۆیی) هۆگر نەگرتنە لەگەڵ حاڵەتێكی كۆمەڵایەتی یا كەلتووری و سیاسی، هەروەها نائاشنایەتییە لە دۆخێک، هەروەكو ئەو پرسیارانە: بۆچی؟ چییە؟ لەكوێوە بۆكوێ؟ ئەو پرسیارانە ئەگەر وەڵامیان نەبوو ئەوە مرۆڤ بەبێقەراری دەگەیەنن، لێرەوەیە كە نامۆیی لە هەستێكی سادەی مرۆڤایەتییەوە كە هەمیشە هەبووە، دەبێت بەچەمكێكی فەلسەفی و فیكری لەلای هەندێ ڕووناكبیر، بەڵام لەلای من، نامۆیی، شێوەیەكی بیركردنەوەیە، هەستێكە نەک بیرۆكەیە، نە فەلسەفەیە. لەو ڕۆژەوەی ئادەمیزاد پرسیاری بوون و نەبوون، مان و نەمان، ژیان و مردنی، لەخۆ كردووە، هەستی نامۆبوون هەبووە و، تا دێ بەرفراوانتر دەبێت.

*** لەحزەكانی داهێنان ئێجگار دەگمەنن!**

**داهێنان چییە؟ كەی مرۆڤ دەگاتە داهێنان؟... چۆن لە داهێنان دەگەن؟**

- هەستی تیژ بەنامۆبوون... سەرچاوەیەكی ڕەسەنە لە سەرچاوەكانی داهێنان. بێگومان سەرچاوەی دیكەش هەن.

سەرەتا دەبێ پەردەیەک لە نێوانی (داهێنان) و (دۆزینەوە) دابنێین. هەر داهێنانێک لە هەمان كاتدا دۆزینەوەشە (كشف/اكتشاف)، بەڵام هەموو دۆزینەوەیەک داهێنان نییە.

له فـــەرهەنگی کـــوردیدا داهێنان بەچەندین مـــانا هاتووە، وەکـــو: ڕەخسـاندن، خـوڵقـاندن، ئەفـراندن، ئافـەریدکـردن، ڤـەداندن، چەمـینەوە، ڕامکردن، کـەوی کـردن، لەنوێ هێنانەوە، وەدی هێن. داهێـنان (ئیـبـداع) بەمـانای جـوانکاری و شـیـرینی کـاریش دێ، بۆ (ئیـخـتـراع)یش بەکـاری دەبەن.

بەڵام دۆزینەوە (کـەشف/ ئیـکتـشـاف) بڕێک جـیـایە لە (داهێنان)، چونکە دۆزینەوەی زانستی یا جیـۆگرافی و جیـۆلۆجی (بۆ نموونە) بەمـانای دۆزینەوەی شـتـێکە کـە هەبووە، بەڵام خـەڵکی ئاگـایان لێ نەبووە، وەکـو وزەی کـارەبا، وزەی ئاو بۆ کـارەبا، ژیان لە جەمسـەری باکـوورو باشـوور، پێکهاتی زەڕڕە، نهێنیەکانی کاری مێشک... هتد!.

ئەمما داهێنان، دانانـی، یا خولّقاندنی، یا دۆزینەوەی شتـێکە کە نەبووە، یا بەرهەمهـێنانی شـتـێکی نوێیە کـە پێشـووتـر لە وجـودا نەبووە، وەکـو: تابلۆی شێوەکاری، پەیکەر، ئاهەنگێکی مۆسیقی، سەمایەک، ڕۆمانێک، شیـعرێک، چیرۆکێک، شێـوەیەکی نوێی جلوبەرگ، یا بیناسـازی ڕەنگ و دیکۆر و شتی دیکە.

هەندێ ئیـخـتـراع لە هەمـان کـاتدا داهێنان وەکـو فـڕۆکە، ئۆتۆمـبیـل، ژێر دەریایی و جـۆرەها بەرهەمی تەکنۆلۆژی نـوێ... کـۆمـپـیـوتەرو ئینتـەرنێت و هی تر.

کـەواتە: داهێـنانـی هونەری و داهێـنانـی زانسـتـی و تـەکنۆلـۆژیش هەیە. وابزانم مـەبەست لە پرسـیـارەکـەت، زیاتر، داهێنانی هونـەرییـە (چیـرۆک، شـیـعـر، ڕۆمــان، شـانۆ... و پەخـشـانی هونەری و، ئاوازو ئاهەنگ و شـێوەکـاری و ئەوانی دیکە) داهێنان بەگـشـتـی، دانان، یا خـولّقـاندن و کەشفی شتێکە کە پێشـووتر نەبووە هەرچەنـدە بەلای منەوە، هیچ شتـێک نییـە کە نەبوو بێت، یا ئەسلّێکی نەبێت، بۆ نموونە کـێشـانی تابلۆیەک، بەشـــێکی هەیە کـــە ڕەنـگ و ڕووناکی و وزە و، پـارچە یا دار یا هەر

ماتریالێک بۆ تەختەی تابلۆ بەکاردێت لەگەڵ فڵچەو دەست و پەنجەی هونەرمەند. ئەو بەشەی کە نەبووە، یا دیار نییە، شێوەیەکە لە هزر و خولیا و هەستی دەروونی هونەرمەندەوە هەڵدەقوڵێت (با ئەم بەشە، وزەی بیرو بیرکردنەوەی ناو لێ بنێین)، کەواتە: تابلۆکەش، بەشێوەیەک ئەسڵی هەیە. یا بۆ دانانی ئاوازێکی نوێ: پێویستت بەئامێری مۆسیقایە، لەگەڵ شەپۆلی دەنگ و هەر هۆیەکی دیکەی فیزیکی وەکو دەست و بەپەنجەو شان و قۆڵی هونەرمەندو هۆڵ و شتی دیکە، کە هەموو هەنە (پێشووتر بوون).

دەمێنێتەوە نەغمەکە و هارمۆنی شەپۆلەکانی دەنگ کە بەشێوەیەک یەک دەگرنەوە تا پارچەیەکی نوێی مۆسیقای لێ دەردەچێت، ئەوەش بۆ هزرو خەیاڵ و شارەزایی هونەرمەندەکە دەگەڕێتەوە، لە حاڵەتی ئاوازیشدا زۆربەی ڕەگەزەکانی داهێنان هەن و لەبەرچاون، ئەوەی نادیارە (هونەر)ی هونەرمەندەکەیە، کە دەتوانین ناوی (خولقاندن)ی لێ بنێین.

ئەو دوو نموونەیە، بۆ خولقاندنی تابلۆ یا ئاواز (هەروەها شیعرو چیرۆک و جۆری دیکەی هونەری نووسین)، لەیەک یاسای گشتیدا یەکدەگرنەوە، ئەویش یاسای خولقاندنە. لەڕووی شێوە، یا فۆرمەوەش یەکدەگرنەوە و ئەوینش ئەم وەرچەرخانەیە: کە خولقاندنی هونەری لە ئەنجامی جێگە گۆڕکێ و ئاڵوگۆڕی پێوەندی نێوانی ڕەنگەکان (شێوەکاری) یا شەپۆلی دەنگەکان (مۆسیقا)، یا پیت و وشەکان (ئەدەبیات)دا، پێکدێت، تۆ ئەگەر وشەکان (بەم شێوەیە) بەکاربهێنیت ڕستەکان بەجۆرێک دەردەچن کە شانۆ بخولقێنن، یا پەخشانی چیرۆک و ڕۆمان، یاشیعر و هی تر.

لێرەوە... دەگەینە کرۆکی پرسیارەکە: (کەی دەگاتە داهێنان؟)... بەواتایەکی تر کەی لەحزەی خولقاندن دەگات؟.

خولقاندنی هونەری لەو لەحزەیەدا دەبێ کە زەین و هەست و دەروون، لە کۆت و زنجیری دیکتاتۆریەتی هۆشیاری ڕزگاری بووبێت، لەو لەحزەیەدایە کە جۆرە نائاگاییەکی قووڵی دوور سەرهەڵدەدا و زاڵ دەبێ، دوور لە

پاڵەپەستۆی (بیر و بیرکردنەوە)... وەکو بڵێی سروە (ئیلهام) لە کانگای نادیاری وجودەوە بگات و، بەبێ ئەوەی خۆت بزانی یا بتەوێ (بەڵێ، بەبێ ئەوەی بتەوێ،... چونکە خولقاندن بەخواست و ئارەزوو نایەت، بەڵکو خواستی زۆرەکی دەیتۆرێنێ)... ئا ئەو کاتەیەکە بەرهەمی خۆڕسکی داهێنان یا پرۆسەی داهێنان وەکو کانییەکی زوڵاڵ بەهێمنی بڵق دەدا و دەکەوێتە ڕێ. هەربۆیەش خولقاندنی هونەرییان بەجۆرە خەونێک ناساندووە و شوبهاندووە. ئالێرەیە کە هەندێ فەیلەسووف پرۆسەی خولقاندن بەنوێ بوونەوەی ژیان (دووبارە خوڵقاندن)، یا دروست بوونەوەی ماجەرای وجود، دەزانن.

واپێدەچێت... بەبڕوای من ئەم گەردوونە، بەگشتی، بەم مەزنایەتییەوە، لە لەحزەیەکی وەهادا، وەکو پرۆسەی خوڵقاندنی هونەری، خولقێنراوە، کردگار فەرموویەتی: (ببە! و... بووە)... بۆ شادی و کایەی خۆی خوڵقاندوویەتی...، واتە: سەرەتا (دەنگ) بووە، ئەمجا (ڕەنگ). ئێستا فیزیکزانان بەتۆمارکردنی یەکەمین دەنگی تەقینەوە (بیگ بانگ/ بانگی گەورە)، گەیشتوون، کە بەپێچەوانەی ئەوەی بۆی دەڕۆیشتین ئەوەندەش دەنگێکی سامناک و گەورە نەبووە، بەڵکو شێوە چرپەیەکی هێمنە، وەکو ئەوەی بەئارامی بەگوێی منداڵەکەتا بڵێی: ڕۆڵە زۆرم خۆش ئەوێی!.

*** ئەی پرۆسەی خولقان؟**

- دەنگی خوڵقاندنی گەردوون، هێمن و ئارام بووە، واپێدەچێت لە هەر پرۆسەیەکی دروستی خولقاندنی هونەریدا شێوەی خولقاندنی ئەم گەردوونە دووبارە دەبێتەوە، ژیان بەخۆی لە ٩٩,٩٩٩٩ ٪ (تا دەیان ٩ی دیکە) بەڵکو زیاتر هەر دووپاتبوونەوە و جوینەوەی ئەوەیە کە هەبووە و هەیە، لەحزەی خولقاندن ئێجگار دەگمەنە، لەبەر ئەوەیە دەبینین لەنێو ملیۆنان بەرهەمی هونەری یەک دووانیان بەرگەی زەمان دەگرن و دەمێننەوە، پەڕاوە

ئایینییه بەرزەکان بەرهەمی لەحزەی خولقاندنن، جوانترین مۆسیقای بیتهۆڤن، وەکو شارەزایانی مۆسیقا دەڵێن، پارچەیەکی چەند دەقیقەیە بەناوی (ئا ئەمەیە ژیان... یا: ئەمەتا ژیان)، شیعری باوە (بابا) تایەری عوریانی هەمەدانی دەمێنێتەوە، لێ باری چەندین لۆری کتێبە شیعری دیکە لەبیر دەچنەوە!.

ڕەنگە هەندێ گۆرانی حەسەن زیرەک لە زۆربەی هەرە زۆری بەرهەمی گۆرانی بێژەکانی دیکە زیاتر بمێننەوە.

* ساتەکانی داهێنان لەچیدایە؟

- لەحزەی داهێنان ڕەنگە خۆشترین کاتی لەزەت بەخشی ژیانی هونەرمەند و نووسەر بێت، هەروەها لەحزەی دۆزینەوە جوانترین کاتی دۆزینەوەرە. ئەگەر مەبەست لە پرسیارەکە لەحزەی خولقاندن و پرۆسەکەی بێت، ئەوە (سەرەڕای هەموو ئەوەی کە گێڕامەوە) هێشتا زەحمەتە بەدروستی دەری ببڕم، چونکە پرۆسەی خولقاندن تاکەکەسییە، زاتییە، بەندە بەشێوەی ژیان و بیرکردنەوە و چالاکی ئینسان بەتەنیا، خۆی بەتەنیا... و خۆی نەبێت کەس ناتوانێ بەدروستی ئاگای لە ختوکەو مچوڕکە و ئارامی دەروونی ئەو بێت، هەر خولقێنەرێک جیهانێکی سەربەخۆیە.

داهێنەران و دۆزینەوەران (دۆزەوەران) خولقێنەری شارستانی و ڕۆشنبیری و پێشکەوتنی کۆمەڵگای مرۆڤایەتین، فەیلەسووف و زانا و بیردۆزە گەورەکان، لەگۆشەیەکەوە، دەچنە خانەی داهێنەرانەوە، سوکراتی فەیلەسووف بەخۆی کتێبی دانەناوە و نەینووسیوە، لێ بەشێوەیەکی وەها تۆی بیروبۆچوونی چاندووە کە لە هەر خاوەن کتێبێک قووڵتر ڕیشەی داکوتاوە، ئەمەیان یەکێکە لە سەیرو سەمەرەکانی پرۆسەی خولقاندن، کە هەرچەندە لێی بدوێین، ئەمجاش بەنهێنی و تەماوی دەمێنێتەوە.

* داهێنانی ڕاستەقینە لە چیدایە؟

– وەکو گوتم: سەرجەمی پێشکەوتنی مرۆڤایەتی بۆ بیروچالاکی داهێنەران و دۆزینەوەران، بەگشتی، دەگەڕێتەوە.

لێرەوە، چەمکی (داهێنان) بەمانایەکی فراوانترو گشتتر بەکار دەبەم و دەڵێم: دانان، یا دۆزینەوەی هەر شێوەیەکی تازە بۆ بەکارهێنانی شتومەکی سروشت و ڕەگەزەکانی، جۆرە داهێنانێکە.

بەو مانایە، ئەوەی بڕینەوەی (خشتی گڵ)ی داهێناوە، بەر لە دەیان هەزار ساڵ، داهێنەر بووە، کێیە؟ نایناسین، ئەوەش کە ئاگردانی داناوە، یا کوڵاندنی گۆشت، چاندنی گەنم و نۆک و نیسک، بەخێوکردنی بزن و قازو سۆنە و ئاژەڵی تر...

هەرهەموو، بەراورد لەگەڵ سەردەمی خۆیان، داهێنەربوون.

لە چین بۆ یەکەم جار لغاوی ئەسپ و پاچگە (چەرخ) و شتی وەهایان داهێناوە، بەتایبەتی (چەرخ)، ڕۆڵێکی هەرە گرنگی لە پێشکەوتنی پیشەسازیدا هەبووە، ئیمڕۆشی لەگەڵ بێ، لێ داهێنەرەکەی ناناسین. داهێنانی دروستکردنی پارچەی هەورێشم لە بەرهەمی کرمی هەورێشم، یا چاپ و قاپ و قاچاغی چینی، کە هەموو داهێنانی خەڵکی چینە، دەچنە پاڵی ئەو داهێنانەی داهێنەرەکانیان نەزانراون.

لە سێ سەد ساڵی دواییدا زۆربەی هەرە زۆری داهێنەرانی زانستی و پیشەسازی ناسراون: داهێنەرانی ئۆتۆمبیل، شەمەندەفەر، تەلەفۆن، فڕۆکە، چاپی نوێ، تەلەگرام، میکرۆبی نەخۆشی، دینامیت، تیشکدەرەوە، زەڕەر و سەدان دۆزینەوە و داهێنانی دیکە کە شارستانیی ئیمڕۆی لەسەر دامەزراوە.

بۆ ئاگرکردنەوە بەرزترین داهێنانی سەردەمی کۆن (قاو و چەخماغ) بووە، کە تا ئەم دواییەش لە هەندێ جێگە بەکاریان هێناوە، دواجار لە قاو و

چەخماغ بۆ شخاتە، ئەمجا بۆ چەخماغ و ئێستاش بەتەزووی کارەبا و... هتد! داهێنان بەرەوپێش چووە.

یا لە قەوانەوە بۆ کاسێتی تەسجیل ئەمجا تازەترین کەرەستەی کۆنترۆڵی دەنگ.

داهێنانی جلوبەرگ، ئامێری کاتژمێر، ئاو دەرهێنان، بیناسازی، کەرەستەکانی بیناسازی و... هتد! ... گەر بەدەوروبەری خۆتا بڕوانیت، سەدان شتی دیکە دەبینیت، بەبیرۆکەی ژینگە پارێزی و پشتگیریی تەندروستی و کەرەستەی خواردن و هی ترەوە، کە هەریەکیان لە داهێنان و دۆزینەوەی کەسێکە یا چەند کەس پێکەوەیە.

لەو میانەدا، مرۆڤ کە وەها شەیدای داهێنان و دۆزینەوە دەبێ، هەندێ جار شتی مەترسیدارو وێرانکەریش دادەهێنێ، وەکو (دینامیت) کە ئەلفرێد نۆبڵی خەڵات بەخش دۆزییەوە، یا وەکو جۆرەها (مین)ی دژ بەمرۆڤ و دژ بەتانک و گەمی و ژێر دەریایی، کە ئیمڕۆ ڕووی زەوی بەسەدان ملیۆن مینی پڕ لە مەترسی چێنراوە و مین بووە بەچەکێکی کۆمەڵکوژەو، باس لە قەدەغەکردنی دەکەن. یا دۆزینەوەی هێزی ئەتۆمی و داهێنانی چەندین شێوەی پڕ لە خەتەر بۆ بەکارهێنانی، کە ئێستا زۆر ناوچەی سەر ئەرز کراوە بەکۆگایەکی هەرە خەتەرناکی چەکی ئەتۆمی و زبڵ و پاشماوەکانی، کە زانایان و پسپۆڕانی عەسکەری و سیاسی و ژینگە پارێزی سەریان لێ سوڕماوە و، نازانن چۆن و کەی زەوی لەو بەڵا دەرداوییە پاک بکەنەوە. چونکە زبڵ و پاشماوەی ماددە ئەتۆمییەکان ڕەنگە بۆ ملیۆنان ساڵی دیکە بمێننەوە و، هەمیشە بەخراپی کاریگەر بن لەسەر سروشت و لەسەر تەندروستی و ژیانی ئینسان و گیانلەبەرانی دیکە.

مرۆڤ تا ڕادەیەک بووە بەدیل و کۆیلەی داهێنان و دۆزینەوەکانی خۆی، واتە دیلی شێوەی بیرکردنەوەیەتی.

* ئەی لە بواری دیکەدا؟

داهێنانی زانستی و تەکنۆلۆژی (لەبواری پزیشکی و کۆمپیوتەر و ئینتەرنێت و تەلەفزیۆندا... بۆ نموونە) لە هەندێ بوارەوە بەرزو جوان و سوودمەندە لێ هەندێ داهێنانی زانستی و پیشەسازی خراپ و نەرێ (سەلبی) و زیانبەخشن بۆ ئێستا و ئاییندەی کۆمەڵگای بەشەرییەت.

ئەمما داهێنانی هونەری، تا ئێستا، هەمیشە جوان و سوودمەندو ئومێد بەخش بووە... داهێنانی هونەری جوانکارییە و جوانی بەژیان دەبەخشێت.

هەندێ قوتابخانەی ڕۆح (بۆ پەروەردەی ڕۆحی مرۆڤ) کە لە جیهاندا بڵاو دەبنەوە، لە داهێنانی هونەرییەوە نزیکن، هەندێکی لە ڕێگای داهێنانی هونەرییەوە دەرگای پەروەردەو ڕزگاریی ڕۆحی دەکەنەوە، بەتایبەتی ئەو ڕێگایانەی کە ئاهەنگی ئارامی مۆزیک بەکاردەبەن.

لەلایەکی دیکەوە فیزیا زانان لە ڕێڕەوانی ڕزگاریخوازی ڕۆحی نزیک دەبنەوە. زانستی زانستەکانی سروشتی، کە فیزیایە، لە زانستی ڕۆح نزیک دەبێتەوە کە بە(زانستی زانستەکان)ی ناو دەبەن.

دوو ڕێگای گەیشتن بەڕاستی هەیە، کە زانست و سروە (ئیلهام)ن، خەریکە یەکدەگرنەوە. بەکورتی... داهێنان و دۆزینەوە (کە زۆربەی جاران لەبەر پێویستی ژیان دێنە پێش، وەکو ڕادار بۆ ئاشکراکردنی هێرشی فڕۆکەی دوژمن، دەڵێم: داهێنان و دۆزینەوە دینەمۆی بزاڤی پێشکەوتنی کۆمەڵگان (هێزی بزوێنەرن)... بەڵام چەند کەسن کە لە مێژوودا دایان هێناوە؟ ئەگەر بەراوردیان بکەین لەگەڵ ئاماری خەڵکی زەوی، کە ملیۆنان ساڵە دەژین، دەبینین کە داهێنەرو دۆزینەوەرەکان ئێجگار دەگمەنن. تا ئێستا ڕەنگە هەزاران هەزار ملیار ئینسان لەسەر زەمین ژیابن، کە ئێجگار زۆرن و بەئاسانی ئامار ناکرێن. لێ... هەموو داهێنەر و دۆزینەوەرەکان ڕەنگە لە ٦-٧ هەزار کەس ڕەت نەبن، کە بەدرێژایی مێژووی ئەم جۆرە

بەشەرە (جۆری دیکەی بەشەر هەبووە)، شتی تازە و تازەتریان داهێناوە. لەمانەش کەمیان ناسراون، زۆربەی هەرە زۆریان نەناسراون. بۆنموونە: کێیە یەکەمین کەس کە بیرۆکەی خەت و نووسینی داهێناوە؟ ئەمجا لە هەر زمانێکدا کێن ئەوانەی کە شێوە و وێنەی نووسینی زمانەکەیان داناوە؟ کێیە ئەو کەسەی بیرۆکەی گۆزەگەربی دۆزیوەتەوە تا قوڕ بەئاگر سوور بکاتەوە؟ کێ کەوچک و ئامان و تەشت و شانە و ئاوێنە و پەنجەرەی شووشەبەند و چرا و بسمار و پارە و کڵاشی هەورامی و پاڵتۆی چەرم و کاغەز و سندوق و ڕەشمە و ناڵە و سۆپە و سەدان شتی دیکەی داهێناوە کە بۆ ژیانی ئینسان پێویست و سوودمەند بوون و، ئێستاش زۆربەیان پێویستن. داهێنەرانی ٣-٤ هەزار کەرەستە و کاڵا و شتومەکی گرنگ نەناسراون و، ڕەنگە ئەبەد نەناسرێنەوە، مەگەر زانستی دۆزینەوەرانی ڕازی ژینە تێک ژینیۆم هەندێکی ئاشکرا بکات؟!

دەگەڕێمەوە بۆ داهێنانی هونەری، کە ئێستاشی لەگەڵ بێت، ئەو چالاکییە بەرزە مرۆڤایەتییەیە ڕەنگدانەوەی جیهانی بەرزی ڕۆحی و زەینییە (ڕۆح و زەین لە جەوهەردا یەکن، وەکو مادده و وزە، تاریکی و ڕۆشنایی، نێر و مێ، بوون و نەبوون ئەم چەمکە لە تێگەیشتنی فەرهەنگی چینیدا خۆی دەنوێنێ.) مەبەستم ئەوەیە کە داهێنانی هونەری وەکو باخەوانە، دار و درەخت پەرچ دەکا و ئەرزی باخەکە دەکێڵێ و لە دڕک و داڵ بژاری دەکات، هەمیشە بەخاوێنی و تەڕپۆشی و جوانی دەیهێڵێتەوە. کەواتە: داهێنانی هونەری زەین و ڕۆحی ئینسان لە پیر بوون و نەخۆشی و بەستەڵەک و وشکبوون دەپارێزێت. هەمیشە ئاویان دەدات و، بەشاداوی و سەوز و پرشنگدەر و چالاک و نەونەمامی و قەشەنگی، ڕایان دەگرێت. داهێنانی هونەری خولقێنەری شادمانی و خۆشی و گەشبوون و ئومێدە. بەرەو چاکتر و بەرزتر بانگ دەدا... ئاها! وەرن. لەو چاڵ و چۆڵییە ڕامەوەستن، لەو دڕک و داڵە دەرچن... چاوتان بەئاو و

بەڕووناکی بشـــۆنەوە. ڕوو لە ئاســـۆی ســـەحـــەر بکەن، بەرەو بەرزی هەڵبکشێن، هێزێکی مەزنتان پێ بەخشراوە، وزەیەکی دەگمەنتان پێ دراوە، بیدۆزنەوە، باڵی پێ بگرن... وەرنە سەرەوە، ڕامەوەستن!

پرۆسەی داهێنانی هونەری دووبارە بوونەوەی خولقاندنی ژیان و گەردوونە. ژیانی مرۆڤ بۆ یەک دەقیقەیە، بۆ خولێکە. ئەگەر ئینسان نەتوانێ لە یەک دەقـقـەدا، لە ئەم گەردوونە تێبگات، مەحاڵە لە دەیان ساڵیشدا لە شتێک بگات!

*** پرسیار:چ شتێک بوو بەکەسەر لە ژیانتا؟**

– حەز و ئارەزوو و خۆزگەم زۆر بوون، ڕەنگە هەر ئینسانێک، وەکو من، دەیان خۆزگە و ئارەزووی هەیە، نەگەن بەجێ. سەردەمێک لەوە نارەحەت دەبووم کە ئەم حەزە یا ئەو خۆزگەیە سەوز نابن، بەئەنجام ناگەن. لێ... زوو فێر بووم چۆن خۆم ڕابهێنم. ئینسان لە هەموو گیانلەبەرەکانی دنیا زیاتر و باشتر و زووتر دەتوانێ (خۆی ڕابهێنێ)، خۆی لەگەڵ هەلومەرجی ژیان بسازێنێ. ئەم (خۆ سازانە) زۆر گرنگە. من فێر بووم زوو دەست هەڵبگرم لەو حەز و ئارەزوویانە کە مەحاڵ دێنە بەرچاو، یا نرخێکی گرانیان دەوێ، بەڵام ئەوەندە ناهێن. هەندێ شتیش بووە، تازە ناگەڕێتەوە. لەم حاڵەتانەدا وەکو ئەم کابرایە دەکەم، کە لە لێواری جۆگەیەکی ئاو دانیشتبوو نانی دەخوارد، پارچە نانێکی کەوتە ناوجۆگە، ئاو بردی هەوڵی دا نانی بۆ نەگێرایەوە. بەناچار گوتی: بڕۆ! بەخێری بابم! بەلاگێڕ بیت! بەو شێوە بیرکردنەوەیە، نەمهێشت شتێک ببێت بەکەسەر لە ژیانمدا.

*** چ نووسەرێک کاری لە ژیانت کردووە وەکو ڕۆشنبیرێک؟**

– درەنگ تەتەڵەی نووسینە کۆنەکانم دەکەم. لەگەڵنجیدا زوو زوو خۆم بەسەردەکردەوە. دەفتەرم هەبوو، نەبەشێوەی یادداشت بەڵکو بەپێی تێبینی و سەرنجی ڕۆژانە دەربارەی ژیان، لاپەڕەکانیم ڕەش دەکردەوە، ئەو کاغەزە

سپیه ئارام و بێدەنگ خۆی بەدەستەوە دابوو، هەرچیم لە ڕووی بنووسیبا وەری دەگرت، من بەوەشەوە ڕانەدەوەستام، هەندێ جار بەنووسینەکانما دەچوومەوە. دەکەوتمە ناو دێڕو ڕستە و وشەکان، بژارم دەکردن... ئەمە ڕاست نییە بابیسڕمەوە، ئەو ڕستەیە ناشیرین و نابەجێیە، ئەویش هیچ... ژیان دووبارە بوونەوەیە... با هەڵبگیرێت، بەو شێوەیە چەند ڕستەم بۆ دەمایەوە کە، بەلای خۆمەوە، خولاسەی مەبەستە.

دریغیم لە سڕینەوە و فڕێدان و سووتاندن نەدەکرد، هەندێ جار وەکو بازییەکی خۆشم دەهاتە بەرچاو، ساڵ هات و ساڵ ڕۆیشت... کەوتمە ناو ژیانی پڕ لە کارەوە، ئیتر پەرت و بڵاو دەمنووسی، بابەتێکی نیوەچڵ لێرە... نیوەکەی تری نازانم لەکوێ... تێبینی و بۆچوونی ویژدانی و خواپەرستی لەتەنیشتی بابەتی سیاسی و ئابووری، یاهەواڵی زانستی (زۆرم لەلاخۆش بوو تازەترین دۆزینەوەی زانستی بزانم)...بە تەنیشتی یادداشتی سادەی کۆبوونەوە نەپساوەکان.

ڕۆژێک دیتم دەیان دەفتەری تێکەڵ و پێکەڵ و سەدان پارچە کاغەز بەسەریەکا کەوتوون، جانتایەکیان داگرتبوو، دانیشتم: خوایە! چی بکەم؟... خەریکم لە هەندێکی سەر دەرنەکەم، بەپێی نەریتێکی کۆن، مێژووی هەر نووسینێک تۆماردەکەم... لێ ئەمجارەیان لەوە دەرچووبوو، چونکە لە هەندێ دەفتەردا ڕەچاوی زنجیرەی مانگ و ساڵیشم نەکردبوو، هەرچۆنی ڕێکەوتبوو نووسیبووم، لە دەفتەرێکی ساڵی ١٩٧٩ لاپەڕەی سپی هەبووە، لە پڕدا ساڵی ١٩٨٣ بەچەند تێبینی پڕم کردۆتەوە.

جەنجاڵ بوو. کەوتمەوە یادی گەنجێتی، خۆ ئەو سەردەمە بێباک بووم... هەرچیم بەدڵ نەبا دەمدڕی و دەمسووتاند، ئیتر کێشەکە بەخۆی چارەسەر دەبوو، ئەمجارەش بۆ وەها نەکەم؟! بە ئەسپایی و ئارام ئارام کەوتمە دڕینی کاغەز و دەفتەر (دوای ئاوڕدانەوە لە ناوەڕۆک... دەمزانی کامەیان

گرنگتره)... نەخێر! گەرم بووم. ئەمجا بەخێرایی دەمدڕی. سەبەتەی زبڵ پڕبوو، شەوانێکی درەنگ بوو، چووم لە ژوورەکانی دیکە یەک دوو سەبەتەی دیکەی زبڵم دۆزییەوە، ئەوانیش خەریک بوون پڕ ببن. پەنجەکانم ماندووبوون، ڕاوەستامەوە... خوایە! فەوتان لە خولقان زەحمەتترە. نایەتە بیرم، ئەگەر لەنووسیندا ماندوو بووبم... بەڵکو بەشەوق دەمنووسی، بەڵام دڕین و فەوتان زەحمەتترە. چیم لە کاغەزە فەوتاوەکان نووسیبوو؟ لەلام گرنگ نەبوو، هەرچی بوو فەوتا و تەواو... تۆ بڵێی «شاکارێکم!» زیندەبەچاڵ کردبێت؟ بڕواناکەم... چونکە دەزانم کە نووسەرێکی «بلیمەت» نیم، بەڵکو نووسەرێکم و هیچی تر... دانیشتم لەخۆم بپرسم: بۆچی نووسیومن؟ بۆچی دەنووسم؟ باشن؟! خراپن؟! سەرەنجام بەوە دڵی خۆم دایەوە کە نووسینەکانم بەخوا دەسپێرم، خوا خۆی ئاگادارە چیم نووسیوە، ئەگەر باش بووبن، ئەوە ئومێدەوارم پەروەردگار بەباشی بیگێڕێتەوە، ئەگەریش خراپ بووبن، ئەوە فەوتان و ئیتر مەترسیم نییە کە نووسینی خراپ بکەوێتە دەستی خەڵک و زیانیان پێ بگەیەنێت. خوا خۆی دەزانێ چیم نووسیوە، بەوی دەسپێرم.

لێرەدا پرسیارێکی خەتەرناک و هەژێنەر بەزەینمدا چەخماخەی دا... منێک ناتوانم چەند دەفتەرو پارچە کاغەزی دەسنووسی خۆم لێک جیا بکەمەوە، هاتوومە ئەو ئەرکەش بەکۆڵی (خوا)دا دەدەم، ورد ژمێری خوای دانا چ دەزگایەکی مەزن و ڕۆژژمێری هەیە کە بەحسابی هەموومانا دەگات و... هەموو دەفتەرەکانی ژیانی هەر یەکەمان لە ئێمەی ملیارەها ئینسان، دێڕ بەدێڕو وشە بەوشە لێکدەداتەوە و بەدروستی بەحسابمانا دەگات و سزا یا پادشامان دەخاتە ناو لەپ؟

* ئایا دوای ئەوە گەیشتیە چ ئەنجامێک؟!

- خورپەیەک بەدڵما هات، جارێکی دیکە کەوتمە وێزەی کاغەزەکانم، کەوتمە درین و فەوتانی زۆرینەی هەرچی دەفتەرو کاغەزێک ماوە... لەو لەحزەیەدا بڕوام وەهابوو کە پەروەردگاری بەرزو دانا لە من چاکتر دەزانێ چیم باش و، چیم خراپ نووسیووە. بەو شێوەیە باری خۆم سووک کرد، لە جانتاکەدا تەنیا چەند دەفتەرو بیست سی پارچە کاغەز مایەوە، دەمزانی کە وەختی ئەوانیش دێ.

لەمن دەپرسن: چ نووسەرێک تەئسیری لە ژیانت کردووە؟ بێگومان زیاد هەنە، یەکەمیان ئامۆژگارییەکی (ئەنتۆن چیخۆف)ی چیرۆکنووسی ڕووسییە، کە لە وەڵامی پرسیاری لاوێکدا کە (چۆن بنووسم)؟ دەڵێ: (بنووسە و بسڕەوە!). دەڵێ: مەترسە! زۆر بنووسە، زۆری بسڕێرەوە! زۆری بفەوتێنە، کەم بڵاوبکەوە.

ئەم ئامۆژگارییە بەر لە چل و پێنج ساڵ خوێندمەوە، کە هێشتا تازە پێدەگەیشتم، ئیجگار تەئسیری لێکردم، ئیتر دوای ئەوەی کەوتمە پەیڕەوکردنی، بەخۆمیش دابونەریتی دیکەی نووسینم خستە سەری، تا ئەمەی لێدەرچوو کە بێباکانە دەس لە نووسینی خۆم هەڵبگرم، هیچ وەختێکیش پەشیمان نەبوومەتەوە لە ئەو نووسینانەی فەوتانوومن.

ئەنتۆن چێخۆف و ڕۆماننووسە ڕووسەکانی زەمانی قەیسەری، بەگشتی تەئسیریان لێ کردووم: تۆرجنێف، لیوتۆڵستۆی، گوگول (بەتایبەتی پاڵتۆکەی)، هەروەها نووسەرانی فەرەنسا و ئەڵمانیا و ئینگلیزو وڵاتانی تر وەکو: هوگو، بلزاک، گوتە، نیشتە، دیکنز، دانتی (ئیتالیا) و هی تر.

ئەو دەمە تەنیا لە وەرگێڕانە عەرەبییەکانی بەرهەمی ئەو نووسەرانە کەڵکم وەردەگرت. بەر لەو نووسەرانەش کەسانی دیکە هەبوون کە منیان ڕاچڵەکاندووە، بەزمانی کوردی: دوو بەرهەمی وەرگێڕاوی جەمال نەبەز

(پاڵتۆ)ی گۆگول و (گەرداوە)کەی شکسپیر، هەروەها نووسینەکانی شاکر فەتاح کە لەساڵانی چلەکان دانابوون، ئەم بەرهەمانەم کاتێک خوێندەوە کە هێشتا لە پۆلی یەکەمی ناوەندی بووم تازە، خۆبەخۆ، فێری خوێندنەوەی کوردی سۆرانی دەبووم (بەر لەوە هەورامیم دەخوێندەوە)، لەکاتێکدا زمانی خوێندنی قوتابخانەم عەرەبی بوو، هەر لەم دەمەدا کتێبی مێژووی ئەدەبی کوردیی عەلائەدین سوجادیم بەشەوقەوە دەخوێند.

کتێبەکانی (جەبران خەلیل جەبران)، کە بەعەرەبی بوون، تەئسیرێکی گەورەی لەسەرم هەبوو، کە ئێستاش لە ئایدیاوە لێی نزیکم، کە ئیتر گەورەبووم، نووسەری دیکەش لە ژیانما پەیدابوون، هەریەکە بەشێوەیەک دەوڵەمەندیان دەکردم.

ماوەیەکیش کەوتمە خوێندنەوەی کتێبە ئایینییەکان، هەر ئایینێک با... بۆ خۆم مەراقم لە بەراوردی نێوانی ئایینەکان دابوو، چ ئاسمانی یا غەیرە ئاسمانی... بەخوێندن، بەگشت دونیادا گەڕام، تا بەسنووری (خامۆشی) گەیشتم... ئەو کاتە بوو کە(هەللاج) بوو، بەسونبولی گۆشەیەکی ڕۆژانەی ڕۆژنامەگەری، چەندین ساڵ کە بەعەرەبی لە ڕۆژنامەی (التآخي)، لەسەری چووم، (خامۆشی) یەکەم بەوە دەڵێم کە ناچار کەوتمە بەکارهێنانی زمانی ڕەمزی لە نووسیندا، بەراوردی نێوان بڕواوبۆچوونی ئایینەکان بەجۆرە تێگەیشتنێکی گەیاندم کە ئیتر نەمدەتوانی بەزمانی کراوە بدوێم... هەرچەندە زۆربەی خوێنەران وایان دەزانی کە من بابەتی سیاسی دەنووسم!!.

لەبەر ئەوەبوو کە هەندێ لە نووسینەکانم لە ماوەی حەوت ساڵدا (١٩٦٧-١٩٧٤) هەمیشە جێگەی قسەو بەدواداچوون و مشتومڕی خوێنەران بوو. مەبەستم لە هێنانەوەی باسی پەڕاوە ئایینییەکان ئەوەیە، کە شێوەی داڕشتن و نووسینەوەی ئەو کتێبانە تەئسیرێکی گەورەی لەسەرم بووە، لەکاتێکدا زۆریش بایەخم بەخوێندنەوەی کتێبی مارکسی دەدا، من

زۆرم دەخوێند، خووم لە خوێندنەوە دابوو. هەرچی بەدەستم بکەوتبا دەمخوێندەوە یا هەوڵم دەدا بزانم بەگشتی چی دەڵێت، هەرچیم بەدەست بکەوتبا دەمخوێندەوە.

من لەخوێندندا سانسۆرو سنوورم بۆ خۆم دانەناوە. بێگومان مرۆڤ هەرچی بخوێنێ تەئسیری لێدەکات، چ کەم چ زیاد! تا فێری (هونەری خوێندنەوە) بووم... کە ئینسان هەر کتێبێک دوای ٤-٥ دەقیقە هەڵدەسەنگێنێ و دەزانێ چەندی سوود لێوەردەگرێت، تەنانەت کامە فەسل و ڕووپەلی کتێبەکە بەدەردی دەخوا، نەخاسمە ئەگەر لە بواری پسپۆڕییدا بێت.

ئێستاشی لەگەڵدا بێت، تا دەرفەتم هەبێ دەخوێنم. خوێندنەوە، لەلای من، تەنیا چاوخشان بەدێرو لاپەڕەی کتێب و گوڤارو ڕۆژنامەدا نییە، بەڵکو ڕووداوی ڕۆژانە، یا هەر تێبینییەکی تازە لە هەر سەمینار و کۆنفرانسێک، هەر دانووستاندنێکی سادە، بەشێوەی تایبەتی خۆم دەخوێنمەوە. ڕەنگ هەر هەموو ئەوانە، کەم و زۆر، تەئسیر بخەنە سەر هەر ئینسانێک، لێ من فێر بوومە بەچاوی خوێندنەوە تەماشایان بکەم، تەنانەت کەشوهەواو، بەرنامەی وەرزشی و پێشانگا و میهرەجان و... هی تر!.

ئەم جۆرە خوێندنەوەیە، مانای ئەوەیە کە مێشکی خۆم دانەخستووە و نەمگوتووە کە هەرچی هەیە، ئەوەیە کە ئێستا فێری بوومە و هیچی تر... بەڵکو دەروپەنجەرەی زەریایەکی بێ بن و بێ کنارە. هەر بۆیەش تێگەیشتنم دەربارەی ژیان و گەردوون بەئاسانی دەگۆڕم، ئەویش ئەگەر هاتوو دۆزینەوەیەکی نوێی زانستی، زانیاری پێشووی ڕەت کردمەوە. لە ساڵی ٢٠٠٤دا چەندین قەناعەتم هاتنە گۆڕین و مەودای تێڕوانینی قووڵتر و فراوانترم لە ئاسۆی بیرکردنەوەدا کرایەوە.

بەلای منەوە هەر بیرکردنەوەیەک، خوێندنەوەیە... تەنانەت ئەگەر

بیرکردنەوە بێ لە چۆنیەتی پەڕینەوە لە جادەیەکی قەرەباڵغ...، چونکە لەوێدا ناچار دەبیت باری کۆمەڵایەتی و ترافیکی هاتوچۆ و ڕێبوارانی سوارو پیادە بخوێنیتەوە، لەگەڵ توانا و هێزی ئەژنۆت کە لەچەند دەقیقەدا دەتوانیت بەئەو دیوی جادە بگەیت، بەبێ ئەوەی ئۆتۆمۆبیلێک لێت بدات. لە خوێندنەوەی کتێب و هەر نووسینێکدا، لە لام گرنگ نییە، کێ هایە نووسەر، بێگومان هەندێ نووسەر سەرنجڕاکێشن... بەڵام دیلی بایەخدان بەتەنیا ناوی نووسەر نەبوومە. زۆر جار دەرکەوتووە بۆم کە لە بەرهەمی نووسەرێکی لاوڕا یا لە وتارێکی سادەدا، یا تەنانەت لە هەواڵ و ڕاپۆرتێکدا، تیشکی زانابییەکی تازەو دانابییەکی بەرز خۆی دەنوێنێ، کە لە بەرهەمی گەورە نووسەراندا وێنەیان نییە. من بڕوام بەوە نییە کە نووسەرێکی گەورە یا ناسراو هەمیشە بابەتی جوان و بەرز دەنووسێت، یا نووسەرێکی مام ناوەندیی تازەپێگەیشتوو بەرهەمی بەپێز داناهێنێت. ئەو نووسەرەی مرد بێت، هەرچەندە مەزن بووبێت، ئیتر لە داهێنان کەوتووە، شتی تازە ناڵێ. خشتەی بەرهەم و کاری داخراوە. لێ نووسەرێکی زیندوو، هەرچەندە کرچ و کاڵ و سەرەتایی بێت، هێشتا ئاسۆی شتی تازەتری لە پێشە، دەرفەتی ژیانی ماوە، ڕەنگە ڕۆژێک لە ڕۆژان بەرەو ڕووی وەرچەرخانێکی مەزن ببێتەوە. هەربۆیەش بایەخی زیاتر بەخوێندنەوەی بەرهەمی زیندووان دەدەم. لەبەر ئەوەیە ناتوانم بڵێم کە تەنیا فلانە نووسەر تەئسیری لێکردووم. گەر وا بێ، واتە: لە سنووری کلتووری ئەودا ڕاوەستاوم. بەوپێوانانە ناشتوانم ناوی گشت ئەو نووسەرانە بهێنمەوە کە تەئسیریان لێ کردووم، وەکو ڕۆشنبیر. چونکە ئێجگار زۆرن. کە زۆر جار قسەی نەخوێندەواران کاری قووڵی لێکردووم. نەنکم کە نەخوێندەوار بوو، بەر لە چوونم بۆ قوتابخانە دەفتەرو قەڵەمی بۆ هێنام، گوتی: (ڕۆڵە... بنووسە! فێربە! نووسین وەکو ئەوەیە بەدەرزی بیری ئاو هەڵبکەنیت. بخوێنەو بنووسە).

ئێستاش ئەو بیرە هەڵدەکەنم و بەئاو نەگەیشتووم. ناشزانم کە ئایا دەگەم یا ناگەم.. نەشمزانی نەنکم ئەو پەندەی لە کوێ وەرگرتبوو، یا زادەی بیرکردنەوەی خۆی بووە و هیچی تر؟؟ تا زیندوو بوو لێیم نەپرسی. نازانم بۆچی نەمپرسی. لێ قسەکەی تا ئێستاش کارم لێدەکات. ئەو (نووسەرێکی) نەخوێندەوار بوو، تەئسیری لێکردم و ڕۆیشت. فێری کردم چۆن ژیان بخوێنمەوە.

*** ڕقت لە کورسییە؟ بۆچی هەمیشە دەس لەکار دەکێشیتەوە (ئیستقالە) دەدەی؟**

– کام کورسیت مەبەستە؟ لە چ (کار)ێک دەستم کێشاوەتەوە؟

من لە جێگەی خۆم دانیشتووم. هەمیشە لە جێگەی خۆمم. نەجێگەی کەسی دیکەم گرتووە، نەکەس جێگەی منی گرتووە. کێ دەڵێ کە ڕقم لە کورسییە؟ پەروەردگار پیرۆزمەندیی بەکورسی داوە. هەر کەس لەسەر کورسی خۆبەتی. لەوەش بترازێت، هیچ کاتێک چاوم لە کورسی کەس نەبووە، خۆزگەم بۆی نەخواستووە، چونکە دەزانم لە هی خۆم زیاتر هیچ کورسییەکی دیکەم بەرناکەوێت. ئەگەر یەکێکیش چاوی لە کورسی من بێت، ئەوە خەیاڵی خاوە، چونکە ئەبەد ناتوانێ جێگەی من بگرێت، چونکە پڕ بەجێگەی من نابێت. هەر وەکو منیش ناتوانم جێگەی کەس بگرمەوە. کەس جێگەم پڕ ناکاتەوە منیش جێگەی کەس پڕ ناکەمەوە.کەواتە ڕقم لە کورسی نییە، بەڵکو جێگەیەکی پێویستە بۆ بەرقەراربوونی پێگەی ئادەمیزاد.

لێ لەو مانایە بێزارم کە بەکورسیی دەدەن، لە چەمکی زۆربەی خەڵک پەستم، کە وەها دەزانن دەتوانن جێگەی یەکتر بگرنەوە. من لەو پێوەندییە کۆمەڵایەتییانە بێزارم کە وەکو داوی جاڵجاڵۆکە بەدەوری کورسی ئینسانا دەیئاڵێنن و، دەیتاسێنن و نووزەی لێ دەبڕن. جا ئەگەر ئینسان ئاگای لە

خۆی نەبێ و وەها بزانێ (کورسی کار)، یا کورسی پلەو پایەی کۆمەڵایەتی و سیاسی و کارگێڕی، بەڕاستی هی خۆیەتی، ئەوکاتە دەکەوێتە (داوی کورسی)و، تووشی ڕکابەری و ململانێی بێهوودە دەبێ.

ئا لێرەوەیە کە (دەردە کورسی) دەست پێدەکات. من لەو (دەردە کورسییە) پەست و بێزارم، کە هەندێ جار تۆقم لێ دەچێت، هەر بۆیەش زوو بەزوو دەس لە کارکێشانەوەم پێشکەش دەکەم.

کاغەزی ئیستقالە زۆربەی وەخت لە گیرفانما حازرو ئامادە بووە. هەر کە هەستم بەئاڵۆزی پێوەندییە زنجیرەکان کردبێ، یا دەرکم کردبێ کە لێی کەوتوونەتە تەقە و چاویان لە (کورسی کار) یا پلەو پایە هەیە، یەکسەر کاغەزم دەرهێناوە، یا بەزار ڕامگەیاندووە: فەرموو، خواحافیز! لە کاتێکدا سوور دەزانم کە مەحاڵە بتوانن جێگەم لێ وەربگرن. من هەر لە جێگەی خۆم دانیشتووم.

بڕێک کراوەتر بڵێم: مرۆڤ لە ژیانیا دوو جۆرە کورسیی هەیە، یەکێکی هەمیشەیی تا لە وجودا ماوە، یەکێکی تر کاتی و دەمدەمی و کەسەرو دەردهێنەر.

لە یەکەمیا بدوێم... من لەوەتی لە دایک بووم کورسی خۆم هەیە، لە جێگەی خۆمم. بۆ هەر کوێ بچم و هەرچی بکەم... هەر لە جێگەی خۆم دانیشتووم. بەمانایەکی فیزیکی، هەر بوونەوەرێک (لە زەڕەیەکەوە بگرە تا مرۆڤ و گیانلەبەران، تا دەشت و کێو و دەریاکان، تا ئەستێرەو کاکێشان و تەواوی گەردوون)، لەوەتی دێتە وجودی فیزیکی (بەڵکو میتا فیزیکیش) جێگەی خۆی هەیە، بۆشاییەک پڕدەکاتەوە... چەمکی (بۆشایی) بۆ نزیک خستنەوەی ماناکە دەهێنمەوە، گەرنا بۆشایی نییە، هیچ جێگەیەک نییە بۆش بێت. جێگەی بۆش واتە: نەبوون. بەڵام بوون، واتە، نەبۆشی.

لەم بیرۆکەدا ئەو پرسە دێتەپێش کە من ناتوانم جێگەی چیا یادەریا،

بەرد یا درەخت، پاساری یا ئاسک، یا هیچ شتێکی تر، بگرمەوە. هەر بوونەوەرێک بۆ خۆی جێگەیەکی هەیە(با بڵێین پێی دراوە)، ناشتوانێ چۆڵی بکات، مەگەر نەمێنێ. بەتەواوی نەمێنێ، یا دۆخەکەی بگۆڕێت، وەکو بەفر بتوێتەوە، لەو جێگەیەی ئەسڵی نەمێنێ، لە جێگەیەکی تر ببێ بەئاو، یا ئاو نەمێنێ (جێگەی خۆی چۆڵ بکا)، لە ئاسمانا وەکو هەڵم و تەم و هەور جێگەیەکی تازە بگرێتەوە، یا (گرد) نزم ببێتەوە لەکاتێکدا خۆڵ و بەردەکەی لە جێگەیەکی نەویتر جێگە بگرن، یا گیانلەبەر بمرێ، بەڵام ئێسک و پروسکەکەی لە چۆڵ و دەشت یا لەژێر خۆڵ جێگە بگرنەوە، یا ڕۆحی مرۆڤ لەش بەجێ بهێڵێ و لەئەودیو جێگەی خۆی بکاتەوە... هتد!.

گریمان جێگەی هەر بوونەوەرێک، بەبنیادەمەوە، (کورسیی) ناولێ بنێن، ئەم کورسییە لە کەسەوە بەکەس نادرێ و، لە خاوەنی زیاتر کەسی دیکە ناتوانێت لەسەری دابنیشێت.

من لەو بارەوە خەیاڵم ئاسوودەیە. لێرە بوومە هەر لە جێگەی خۆم دانیشتووم، هەزاران میل دوورکەوتوومەتەوە، هەر لەجێگەی خۆم بووم، لەناو کەشتی، فڕۆکە، یا ئۆتۆمبیل، یا لەناو بازاڕو باخچە، سالۆنی کۆنفرانس، چێشتخانە... هەر لە جێگەی خۆم دانیشتووم. ئەم کورسییە لەگەڵمایە، بۆ هەرکوێ بچم ئامادەیە هەر ئینسانێکی دیکەش هەروەهایە.

لێ من لە کورسی پیشە و پلەوپایە بێزارم و لێی هەڵدێم، چونکە زۆربەی جاران درۆزن و بێ ئەمەکە، لەوەش خراپتر دەمبەستێتەوە و دەمکاتە دیلی ژیانێکی وشکی بەستەڵەک، چونکە کاروباری کارگێڕی بریتییە لە هەزاران و ملیۆنان دووبارەبوونەوەی هەمان کار، هەمان پێوەندی، هەمان دانوستاندن، هەمان چوونە ژوورەوە و ئیمزا و، دووڕوویی و درۆ و... هەمان سیستەم، تا وەهای لێ دێ ئینسان خۆی لە داوی سیستەمێکی وشکی بیروکراتی (زۆربەی جار ستەمکارانە و بێ

بەزەییـیـانەش) ، دەبینێـتـەوە کـە ئازادیی هزر و سۆز و هەسـتی مـرۆڤ دەخنکێنێ.

مـەسـەلەکـەش ڕەنـگە پێـوەندیی بەسـروشـتی ئینسـانەکـانەوە بێت. کـەسـانێک هەن حـەزیان لەو جـۆرە ژیانە هەیە، بەتایبـەتی کـە کـورسی کـارگـێـڕی دەسـەڵاتی لەگـەڵە، ئەوکـەسـانە حـەزیان لە دەسـەڵات ڕانین و فەرمانڕەوایی هەیە... هەندێ جاریش دووچاری ململانێی سەخت دەبن بۆ پاراستنی کورسییەکە، یا بۆ وەرگرتنی کورسییەکی تر.

لە یاسای ژیان و دەسەڵاتداری سیـاسـیدا ئەو مشتومڕە لەسەر کورسی شتـێکی سروشتـییـە و، کۆمـەڵگای بەشەری بەو جۆرە دامەزراوە. چاری ناچارە، ئەو مـلمـلانێـیـە بەردەوام بێت (چ بەشـێـوەی شـەڕو کـودەتا و توندوتیژی، یا بەشێوەی هەڵبژاردن و کاری سیاسی ئاشتییانە).

لێ سـروشـتی هەندێ کـەس (کـە لە کـۆمـەڵگادا کـەمن) لەگـەڵ ئەو ململانێیـە نـاگونجێت، لەبەر دوو هۆی سەرەکی: یەکێکی دەبینن کە ژیان (پرۆسـەی ڕۆژانەی ژیان) بەرزترو بەنرختـرە لەوەی لەو جـۆرە ملشکاندنە بێهوودەیە بەسـەر ببرێت، دووەمیش ئەوەیە کە ئەو جۆرە مـرۆڤانە ناتوانن چەند سـاڵ (هەنـدێ جـار ٢٥-٣٠) سـاڵ لە یەک جـێگەی کـارگـێـڕیدا بچـەقـێن و ببن بەپارچەیەکی سـاردوسـڕی دیواری ئەو سـیسـتـەمـە، کـە هەمیشە دووبارە دەبێتەوە (سەیرە، کە دووبارە بوونەوە یاسایەکی گشتی بنەڕەتی گەردوونە. هەموو شتێک لەخولانەوەدایە).

سەیر ئەوەیە زۆربەی هەرە زۆری خەڵک ئەو سیستەمەیان پێ خۆشترە (سیسـتـەمی ڕۆتینی دووبارە کردنەوە)، چونکە هەمـان میکـانیزمی کـار پەیتا پەیتا دووپات دەکەنەوە، ئیتر پێویسـتییـان بەبیرکردنەوە و داهێنان نییە، لەچوارچێوەی سیستەمەکە بەرەحەتی ژیان دەبەنە سەرو سەری خۆیان بەوەوە نایەشێنن کە جیهان چییە و، ئەم گەردوونە چۆن دەخولێتەوە.

حـەز و ئارەزووی زۆربەی خـەڵک ڕەحـەت پەسـەندییـە، ئاسـوودەیی

خواستنه، تا بەکەمترین ڕەنج و سەرئێشە ژیان ببەنەسەر، لێرەشدا نە گلەییم لە خەڵک نییە، نەڕەخنە دەگرم، نەدۆخەکەم لەلا سەیرە، بەڵکو ئەو دۆخە کۆمەڵایەتییە ئاسایی و سروشتییە، ژیانی کۆمەڵگای بەشەری لەسەر ئەو سیستەمە دامەزراوە، چ بمانەوێ یا نەمانەوێ. بەڵام هەندێ کەس کە زۆر کەمن حەز دەکەن (ئازاد) بمێنن... واتە: ئازاد لە کۆت و پێوەندی دووپاتبوونەوەی یەک ڕەوال، یەک سیستەمی ڕۆژانە یەک شێوەی بەرهەمهێنان، یەک دەنگ و یەک ڕەنگ! ئەوانیش داهێنەرانن ئەم داهێنەرانە ژیان لە جموجۆڵ و گۆڕانکاریی هەمیشەییدا دەبینن، لە جیاتی خۆبەستنەوە بەیەک سیستەمی کارگێڕی و ڕۆژانە، هەوڵ دەدەن ژیانیان ڕەنگاوڕەنگ و جۆر بەجۆر بێ، سروشتی داهێنان ئەوە دەخوازێ کە لەیەک جێگە، یەک سیستەمی کار، دانەچەقێن.

داهێنەران، ئەگەر هەلومەرجی گوزەرانی ژیان مۆڵەتیان بدات، ئارەزوومەندن هەمیشە ئازاد بمێنن، ئازاد لە کورسی کاری کارگێڕی، هەتا ئەگەر وەزارەتیش بێ، چونکە ئەم جۆرە ئازادییە مەرجی داهێنانە. لە کەشوهەوای ئازادیدا گوڵی داهێنان دەپشکوێ. من خۆم بەو داهێنەرە نازانم کە خۆی لە کورسیی دەسەڵاتداری بەرزتر ڕاگرتبێت پلەی سیاسیم، کە لە هەلومەرجێکی نائاساییدا بەسەرما داسەپاوە (سەردەمێک بوو تەنیا بەرخۆدان/ موقاوەمەتم دەدی و هیچی تر)، ئەو پلەیە، هەندێ جار منی خستووەتە سەرکورسی کە، بەلای خۆمەوە، وەکو ئەرکێکی نیشتمانی و کۆمەڵایەتی مامەڵەم لەگەڵ کردووە، بەڵام نەمتوانی هۆگری کورسی ببم، نەمتوانی لەگەڵی ڕابێم، هەندێ کاری ڕۆژنامەگەری و سیاسی دیکەم لەلا پەسەندتربوو... ڕۆژنامە منی لە کورسی ڕزگارکرد، ناشزانم بۆچی دڵم بەکورسی خۆش نەبوو، هەرچەندە ڕوونشتن لەسەر کورسی وەزارەت خۆشەو پەسەندە. هەروەها کارگێڕی دیکە تووشم دەهات زوو بەزوو خۆم لێ قوتار دەکرد ڕێکخستنی حزبیش، لە هەندێ لایەنەوە، کارگێڕییەکی سەختی

تێیدایە، ڕەنگە هەر لەبەر هەمان نائاشنایی لەگەڵ کورسی و کارگێڕی بوو، کە لەساڵی ١٩٧٩ەوە ئەندامی سەرکردایەتی پارتیم، بەڵام ڕۆژێک لە ڕۆژان هەوڵم نەدا کاروباری ڕێکخستنی حزبایەتی، یا دارایی و کارگێڕیی، لە ئەستۆ بگرم. هەڤاڵانم لە سەرکردایەتیش ماڵیان ئاوابێ و سوپاس بۆیان، کە هیچ کاتێک منیان نەخستە بەرگوشار بۆ وەرگرتنی پلەی کارگێڕی و ڕێکخستن، تەنیا بەکاروباری ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن و سیاسی و پێوەندیی (دبلۆماسی)یەوە مژوول بووم، کە بڕێک ئازادیی داهێنانیان تێدایە، یەک دووجار بۆ ماوەی زۆر کورت، لەبەر ناچاری و پێویستی، هەندێ کاری ڕێکخستنیان پێم سپارد، بەڵام ئەوەندە توندو ستالینی بەڕێوەم برد کە خەریک بوو شیرازەی هەموو کارەکانی دیکە بپچڕێن!.

هەڤاڵان هەر هەموو، بەسەرۆکی بەڕێزەوە، ڕەچاوی سروشتی منیان دەکرد، دیارە زوو بەوە گەیشتن کە بەکەڵکی چی دێم و بەکەڵکی چی نایەم. زۆر باشە، ئینسان توانا و ئاست و قەدری خۆی بزانێت. من نەمدەشاردەوە کە فلانەکارم پێ ناکرێت و، لە فلانە کاردا سەرناکەوم، تاقیم مەکەنەوە باشترە.

نموونە ئێجگار زۆرن، پێویست بەهێنانەوەیان نییە، مەبەستم لە گێڕانەوەی سەرگوزەشتی ساڵانی ڕابردوو، ئەوەیە کە بەر لەڕاپەڕینیش من لە کورسی هەڵدەهاتم (کورسی بەتێگەیشتنی خەڵک)، بەڵام خۆم توند بەکورسییە ئەسڵییەکەوە گرتبوو، کە جێگەم لە خەبات و ڕەنجدان بووە، زۆربەی وەخت بەتام و چێژی خۆشەوە بەرپرسێتی ئەرکەکانم وەرگرتووە.

بۆ وەڵامی پرسیارەکەت، لە کۆتاییدا دەڵێم: من ڕقم لە کورسی (شانسی ژیانم) نەبووە و، ڕقم لێی نابێتەوە و، لە کارەکەم دەست نەکێشاوەتەوە. لێ بەجۆرێک، بەپێی تەمەن و تەندروستی و هەلومەرجی تازەی کوردستان، خۆم ڕاهێناوە، گرنگیش ئەوەیە لێم قبووڵ کراوە.

ناشترسێم لەوەی کە ناچاری شەڕببم لەسەر جێگەی خۆم، چونکە کەس نییە مشتومڕم لەگەڵدا بکات.

کەس ناتوانێ لەسەر کورسی من دابنیشێت.

من لە جێگەی خۆم دانیشتووم.

*** وەکو ڕۆژنامەنووس، لە کامیان، هەست بەوجودی خۆت دەکەیت؟**

- دەزانن کە بەکوردی و عەرەبی نووسیومە، لە ساڵی (١٩٦١-١٩٦٢)دا بۆ یەکەمین جار چیرۆکێکی کورتم لە ڕۆژنامەی (ژین) لە سلێمانی بەنازناوی (لاو) بڵاوکرایەوە... چیرۆکەکە بەکوردی بوو بەناونیشانی (شوان)، ئەگەر لە یادم مابێت! ناوەڕۆکەکەی لە یادمە... شوانێکە لە گوند دێتە شار، لە خاوەن مێگەلەکەی زیز بووە و تۆراوە. لە لای نانەوایەک کار دەکات. لەو لەحزەیەی کە لەبەر گڵپەوگەرمایی فڕنەکە نان بەتەنوورەوە دەدا، ناوبەناو چاوی لە کچێکە هەموو جارێک دێ لەوێ نان بکڕێت... ئەنجامی چیرۆکەکەم لە یاد نەماوە!... واتە لە دەسپێکەوە کارم کەوتە چیرۆکنووسی و ڕۆژنامەنووسی.

بەگشتی لە زۆربەی نووسینە کوردییەکانمدا هەست بەوجودی خۆم دەکەم، بەتایبەتی لە دووزنجیرە وتاری هەفتانە لەگۆڤاری گوڵاندا، یەک بەناوی (خنێرە)، ئەوی تر بەناوی (ڕازی هەفتە). (بەناوی: ڕازی ئیقلیمی چوارەم، لە کتێبێکدا، بڵاویان دەکەمەوە). زنجیرە وتاری ڕۆژانەم لە (برایەتی)یش هەبووە، زۆربەیان پەسەند دەکەم، لە ڕۆژنامەی (میدیا) چاوپێکەوتنێکی دوو هەڵقەییم بڵاو بووەوە کە لایەنێکی دیکەی ژیاننامەی بەندەیە. بەدڵمە. گۆڤاری (رامان)یش دیمانەیەکی لەگەڵدا ساز دام، خراپ نییە، کەموکوڕییەکی لەشێوەی ئاخافتنی خۆمە، من کە قسە بکەم بڕێک تێکەڵاوی دەکەم، چونکە خێرا دەدوێم، ئەگەر بنووسم ڕەنگە

باشتر مەبەستەکەم دەربېرم. دیمانەکەی (رامان) زارەکی بوو، لێ هی (میدیا) بەنووسین وەڵامی پرسیارەکانم دایەوە.

بابەتی دیکەم هەن، لەیادم نەماون، جیا لە هەزاران بەیاننامەو وتاری رۆژانەی رادیۆو رۆژنامە، کە ڕەنگدانەوەی دەسبەجێی سەردەمی خۆیانە، ناچنە خانەی داهێنانەوە، هەرچەندە من لەو لێکۆڵینەوە و وتارو ڕاپۆرتانە پەشیمان نیم، لەو کاتانەدا بیر و بڕوای خۆم بوونە و، بەجێهێنانی ئەرکێکی نەتەوەیی و تێکۆشان بوون. من بەر لە ڕاپەڕین، تەنانەت بانگەوازێکی سادە و کورتم لە ئێزگەوە، بەدڵ و گیان دەنووسی، ویژدانم بەوە ئارامە کە نووسینەکانم پەیڕەوی ڕێبازێکی فیکری و ڕاگەیاندن بوو کە بزووتنەوەی رزگاریخوازی میللەتەکەم، بەڕاپەڕین و هەڵبژاردنی پەرلەمان و فیدرالیزم گەیاند. ناڵێم کە رۆڵێکی بەرچاوم هەبووە، بەڵام تەقەللامان جۆگەیەک بووە رژاوەتە دەریای ڕاپەڕینەکەوە.

بە زمانی عەرەبی، بەگشتی، لە نووسینەکانم لە ڕۆژنامەی (التآخي) رازیم، هەر لە ئایاری ١٩٦٧ەوە، کە یەکەمین بەرهەمم تێدا بڵاوبووەوە، تا ٨ی ئایاری ١٩٧٤ کە ڕۆژنامەکەمان داخست و بەرەو چۆمان بەڕێکەوتم و بووم بەپێشمەرگە و، بەڕێوەبەری ڕاگەیاندن لە یەکەمین ئەمانەتی گشتی ڕاگەیاندن و ڕۆشنبیریی و لاوان لە ناوچەی رزگارکراوی شۆڕشی ئەیلول. لە (التآخي)، لە گۆشەیەکی کورتی ڕۆژانەدا، پتر هەست بەوجودی خۆم دەکەم، چونکە ئازادانە دەمنووسی، کە زۆربەیان ڕەهابوون لە ئەیدیولۆجی و سیاسەت (ناوبەناو نەبێ لەبەر «وەزنی شیعر»... واتە: هەلومەرجی سیاسی ئەو سەردەمە)، ئەو گۆشەیە لە ئەیلولی ١٩٦٧ تا شوباتی ١٩٧٤ بەردەوام بوو، سێ قۆناغ و سێ ناونیشان و نازناوی بەخۆیا بینیوە: یەکەم جار بەناوی (حلاجيات) نووسینی: حلاج، دووەم قۆناغ بەناوی (المدار الاخير) نووسینی: خدر ڕشو، سێیەمینیان بەناوی (صوت) نووسینی: ا- پرشنگ. تا ئێستا کەم کەس ئەو ڕاستییە دەزانن، زۆربەی ڕەخنەگرانی

ئەدەبی و مێژوونووسانی ڕۆژنامەنووس نازانن کە نووسەری ئەو ٣ گۆشەیە، کە نزیکەی ٧ ساڵ بەردەوام بوو، یەک کەس بووە.

دەڵێم (ڕەخنەگرانی ئەدەبی)، چونکە لە هەندێک کتێبدا لەلایەنی نووسەرانی عێراقییەوە، بەعەرەبی باسی ئەو گۆشەیە هاتووە، بەقوتابخانەیەکی تایبەتی لە ڕۆژنامەگەریدا حسێبیان کردووە، یەکێکیان نووسیویەتی کە فلانەکەس یەکەمین نووسەری عێراقییە (گوتوویەتی کە کوردە) توانیویەتی ژیانی (مەنسووری کوڕی هەللاج) بکات بەبابەتێکی ڕۆژانەی ڕۆژنامەگەری و، لە گۆشەیەکدا شێوازێکی تایبەتی بەخۆی دابڕێژێت، بیروباوەڕی نەتەوەیی کوردو سوسیالیستی و تەسەوف تێکەڵاو بکات، هەموو لە پێناو بەرگری لە میللەتە چەوساوە و ئازاردراوەکەی کە میللەتی کوردە بڕوانە، کتێبی (الحلاج موضوعا)، نووسینی د. کامل مستەفا ئەلشیبی، مامۆستای فەلسەفەی ئیسلامی لە زانکۆی بەغدا، ١٩٧٦ز لە بەغدا چاپ بووە.

دەڵێ کە (فلانەکەس) میللەتی کوردی وەکو حەللاج پیشانداوە، کە ئەم میللەتە هەمیشە هەڵواسراوە، قوربانیی بوختان و ستەم و پیلان بووە هەمیشە سەرکوت کراوە...

ئەم مامۆستا بەغدادییە ئەوەندە پەسنی داوم شەرم دەکەم هەمووی بگێڕمەوە، سەیر ئەوەیە کە ساڵی ١٩٧٦ ئەو شتەی نووسیوە، نازانم چۆن کتێبەکەی لە چاوی سانسۆری بەعس ڕزگاربووە، لە کاتێکدا... وەکو دوایی زانیم... ئەو مامۆستا بەڕێزە ئاگادار بووە لەوەی من کێم و، ئەوکاتە لەکوێ بوومە (ئەوکاتە خەریکی ڕێکخستنەوەی موقاوەمەتی دژ بەڕژێمی بەعس بووین).

مەبەست ئەوەیە کە نووسەر لە بەرهەمێکیدا هەست بەوجودی خۆی دەکات کە ئازادانە نووسیبێتی، دیارە ڕاستە، کە ئەو قسەیەی لە دڵەوە دەردەچێ (واتە: ئازاد و ڕەها بێ) دەچێتە دڵانەوە.

دەزانن کە دوای داخستنی (التـأخی) لە ئاداری ١٩٧٤ تا ڕووخانی ڕژێمی بەعس لە نیسانی٢٠٠٣ ئیتر ئەو ڕۆژنامەیە لە لایەنی پارتییەوە، لە بەغدا دەرنەچوو، بەڵکو دوای ڕاپەڕین ڕۆژانە بەناوی (برایەتی) دەرچووە بەکوردی، لە مانگی ئایاری ٢٠٠٣ لە بەغدا، ڕۆژنامەی (التآخي)مان لە فەرامۆشی ڕزگار کرد، جارێکی دیکە کەوتە بڵاوبوونەوە.

لەو ڕۆژەوە تا بەئیمرۆ کە تێدا دەنووسم، دەتوانم بڵێم کە لە تەواوی وتارەکانم لە خولی تازەی (التآخي) ڕازیم و، لە زۆربەیان هەست بەوجودی خۆم دەکەم، بەتایبەتی لە برێک وتار کە دوور لە ئەیدیۆلوجی و سیاسەت نووسیومن، لە ڕۆژنامەیەکی سەراپا سیاسی!.

*** موونافەساتی مەدرەسەی ئەدەبی و ڕۆشنبیری، لەنێوەندی ڕۆشنبیری کوردی چۆن دەبینن؟**

- پرسیارێکی زەحمەتە، لێ زۆر گرنگە، ببوورە، من کە تا ئێستا وەڵامی پرسیارەکانی پێشووم داوەتەوە (سوپاس کە قبوڵت کردوون هەرچەندە زۆربەی وەڵامەکانم بەناتەواو دەزانم)... دەڵێم: مەرج نییە کە بتوانم وەڵامی هەر پرسیارێکی دیکە بدەمەوە.

*** ململانێی ڕۆشنبیری، لەلایەکەوە کز دەبێ، لەلایەکی دیکەوە گوڕ دەستێنێ!**

پرسیاری مونافەساتی ئەدەبی و ڕۆشنبیریی کوردی هەم گرنگە و هەم شایانی بایەخدانی تەواوە، هەمیش ئاسان نییە، بەتایبەتی بۆمن، ئەگەر بەزمانی قوتابییەک لە ئاستی پرسیاری ئەزموونی قوتابخانە وەڵام بدەمەوە، دەڵێم: (مامۆستا! ئەم پرسیارە قورسە، گرانە، وەڵامەکەی بەباشی نازانم).

لەسەرێکی دیکەوەش، وەکو ڕۆژنامەنووسێک کە سەری دەخورێ بۆ هەر پرسیارێک و خۆی لەهەر بابەتێک هەڵدەقورتێنێ، ئەوە ناتوانم خۆم لە

کورته وەڵامدانەوەیەک ڕابگرم... بەپەلە، لەسەرپێ، چەند تێبینییەک، کە لەم لەحزەیەدا بەزەینی مندا دەگوزەرێن، دەخەمە سەر کاغەز، دیسان دووبارەی دەکەمەوە کە ئەم چەند تێبینییە بەوەڵامی تەواو دانانێم.

بەڵکو ئەمێدەوارم نووسەرانی دیکەی پسپۆڕو زاناتر لێکۆڵینەوەیەکی فراوان و پوخت دەربارەی ئەم کێشە فەرهەنگییە بایەخدارە، ئەنجام بدەن.

من هەمیشە بڕێک دەگەڕێمەوە مێژوو، لە بارەی دەمەتەقی و دیالۆگی ناوخۆی ڕۆشنبیریی کوردەواری زۆر دوور ناڕۆم، لە دووسەد ساڵی دوایی بەرەو ئەم لا دێمەوە. سەرەتا لە خۆم دەپرسم: ئایا نێوەندی ڕۆشنبیریی کوردی ململانێ و پێشبڕکێی مەزنی بەخۆیەوە دیوە، کە مەرجێکی گرنگی پێشکەوتنە و هێمای کەلتوورو باری کۆمەڵایەتییە و، دیاردەیەکی سروشتی و تەندروستییانەیە؟

بەڵێ! ململانێ و مونافەساتی فیکری و ڕۆشنبیریی وەها لە مێژووی نزیکماندا هەبووە، بەڵام کورت خایەن بووە، زوو خنکێنراوە، یا لە ڕێگا لادراوە و، مەودای سروشتیی خۆی وەرنەگرتووە، تا کەلتوورمان دەوڵەمەند بکات.

* بۆچی وەهابووە؟

– لەبەر نەبوونی ئازادی و سەربەخۆیی، سەربەستی بیروڕا مەرجی بناغەیی جووڵانەوەی ڕۆشنبیرییە، کە مونافەسات و ململانێی وەکو دینەمۆیە بۆی. نەبوونی ئازادی، ڕێگای نەداوە بەسەرهەڵدانی مونافەساتی گەورەو درێژخایەن کە زۆر سوودمەندەو، زوو بەزوو ململانێیەکانی خنکاندووە و لە باری بردوون.

لێ هەندێ کێشەکێشی گەورەی ڕۆشنبیری بەرپابوونە لێرەدا ڕۆشنبیریی بەلێکگەیشتنی فراوانتر بەکاردێنم تا فیکری سیاسی و ئاینیش بگرێتەوە، نەبەس قوتابخانەی ئەدەبی.

* ئەی لە رووی مێژوو؟

– لە ململانێ و مونافەساتەکانی مێژووی نزیکی ڕۆشنبیریمان چەند نموونە دێنمەوە.

– کێشەی بیروبۆچوونی نێوانی مەولانا خالیدی نەقشبەندی و شێخ مارفی نۆدەیی، تەنیا لە سنووری جیاوازیی ڕێورەسمی تەریقەتی سۆفیگەری ڕانەوەستا، بەڵکو مەیدانی فراوانی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریی ئەو سەردەمەی گرتەوە، کە تا ئێستاش کاریگەریی ماوە. لەسەدەی نۆزدەهەمی زایینیدا، ئەو کێشەیە، تەئسیری لەسەر شاعیرو ڕووناکبیران بەجێ هێشتووە جگە لە خەڵکێکی زیادی نەخوێندەوار.

ئەگەرچی هەندێ شاعیری گەورەی ئەو سەردەمە، بەئاشکرا لایەنگیری ئەم یا ئەویان نەکردووە، بەڵام بەئاشکرا کەوتنە ژێر کاریگەریی ئەم ڕێبازە یا ئەوی تر.

دۆخی ڕووناکبیریی ئەو سەردەمە وەختێک بەچاکی تێدەگەین کە کاریگەرێتی ڕێبازە سۆفیگەرییەکان لەسەر شیعرو ئەدەبیاتی ئەو سەردەمە بەوردی ساغ بکەینەوە.

لە سەدەی بیستەمدا ململانێی فیکری و ڕۆشنبیریی لە کۆمەڵگای کوردەواریدا ئاشکراترو زەقتر بوو، هەندێکی بواری فیکری سیاسی دەگرتەوە، هەندێکی دیکە ڕاستەوخۆ لەنێوانی قوتابخانە ئەدەبییەکاندا بەرپا دەبوو.

وەکو گوتم کە نەبوونی ئازادیی بیرورا دەربڕین مۆڵەتی نەدەدا ئەو ڕەخنە و ڕەخنەکارییانە پەرە بسەنن و بەئەنجام بگەن. ڕەنگە زاراوەی (ڕەخنە) دروستتر بێت لە ئاستی هەندێ کێشەی نێو ڕۆشنبیراندا. هەندێ جاریش بابەتی مێژوویی و ڕاڤەی جیاوازو، هەڵوێست بەرامبەر ڕووداوەکان، دەبوو بەململانێی فیکری و ڕۆشنبیری.

بۆ نموونە لە ساڵی ١٩٥٩ بەدواوە یەک دوو کێشە و ڕەخنەکاریی فیکری- سیاسی هاتنەپێش:

**یەک:** لەنێوان بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان، کە لە پارتیدا بەرجەستە دەبوو، لە سەرێک و بیری ناسیولیستی عەرەبی لەسەرێکی دیکەوە: لەو دەمەدا ڕۆژنامەیەکی عەرەبی بەغدا داوای (تواندنەوەی کورد لە بۆتەی نەتەوەیی عەرەبی) دەکرد. ڕۆژنامەی (خەبات - ١٩٥٩) بەتوندی وەڵامی دایەوە و بەوەی گەیاند کە میللەتی عێراق بەشێک نییە لە نەتەوەیی عەرەبی، بەڵکو تەنیا میللەتی عەرەبی عێراق بەشێکن لە نەتەوەیی عەرەبی. مامۆستا برایم ئەحمەد پتر لە هەمووان ئەرکی بەرپەرچدانەوەی بیری تەسکی ناسیونالیستی عەرەبی خستە ئەستۆ، چ وەکو سکرتێری پارتی و سەرپەرشتی (خەبات)و خاوەن ئیمتیاز و بەرپرسی ڕاگەیاندنی پارتی لەو سەردەمدا، چ وەکو ڕووناکبیرێکی سیاسی شارەزا و ناسراو و مافناس و ئەدیب.

دوو: هەر لە ساڵی ١٩٥٩ بەدواوە کێشەیەکی فیکری- سیاسی دیکە هاتە ئاراوە، کە ئایا (پێویستە لە کوردستانا حزبێکی شیوعی هەبێ، یا دەبێ تەنیا بزووتنەوەی نەتەوەپەروەری ڕزگاریخوازی کورد هەبێ و پێشڕەوایەتی خەبات بگرێتە ئەستۆ؟)... لێرەشدا برایم ئەحمەد لەلایەنی پارتییەوە ڕۆڵی بەرچاوی هەبوو. ئەو پرسیارە گرنگە، لەو بارودۆخەدا، لە بواری حزبی و سیاسی گشتیدا نەوەستایەوە، بەڵکو بوو بەلێکۆڵینەوەیەکی دوو جەمسەرانەی دوولایەنی بەرفراوانی سەرەکی لەو سەردەمەدا: پارتی و نەتەوەپەروەرانی کورد لەلایەک و حزبی شیوعی لەلایەکی دیکەوە.

ئەم کێشەیە بۆ تەواوی نێوەندی ڕۆشنبیریی کورد لەو سەردەمەدا پەلی هاویشت و، کاریگەریتی گەورەی بەجێ هێشت.

* ململانێی فیکری هەروایە؟

- ململانێی فیکریی دیکە لەنێوانی بیری سیاسی و ئەدەبی مارکسیێتی، کە محەمەدی مەلا کەریم نوێنەری بوو لەلایەکەوە و قوتابخانەی ناسیونالیستی کورد، کە جەمال نەبەز و کامل ژیر نوێنەری بوون، لەلایەکی دیکەوە؛ ئەم مونافەسە توندوگەرم بوو، ماوەیەکی درێژی خایاند، کە هەرچەندە لە ساڵی ١٩٦١ بەدواوە ئازادیی دەربڕین، بەتایبەتی بەزمانی کوردی، سەرکوت دەکرا، بەڵام ئەو کێشەیە نەبڕایەوە، کە تا ساڵانی دوایی سەدەی بیستەم بەردەوام بوو. مامۆستا جەمال نەبەز، تا ئەم دواییەش، لە بەرهەمەکانیا جاروبار دەگەڕایەوە سەر ناوەرۆکی ئەو ململانێیە (کە لە سەرەتاوە شیعر و پەخشانی هونەریشی دەگرتەوە).

لەسەرێکی دیکەوە مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم، لەمەڕ ناوەرۆکی چینایەتی شیعری حاجی قادری کۆیی و، وەڵامی مامۆستا مەسعود محەمەد، کە داکۆکیی لەسەر ناوەرۆکی نەتەوەیی شیعری حاجی دەکرد، دەمەتەقێیەکی گەورە و سوودمەندی نایەوە، کە بەلای منەوە، سوودمەندبوو، کەلەپووری ڕۆشنبیریی کوردی دەوڵەمەند کرد (جیا لەوەی کامەیان دروستتر بۆی ڕۆیشتوون، کە لێرە جێگەی نابێتەوە، چونکە دەمەوێ بەپەلە وەڵامی ئەو پرسیارە ببڕمەوە و، تەنیا ئاماژە بەسەر قەڵەمی کێشەکان بکەم، ئەگەر بکەومە ئەوەی کامەیان قووڵترو دروستتر بۆ مەسەلەکە دەچوون ئەوە دەیان لاپەڕەی دەوێ. بۆ خۆم بۆچوونی جیاوازم هەیە لە هەردووکیان).

- مامۆستا مەسعود محەمەد، بەگشتی، هەڵوێستی ڕەخنەگرانەی بەرامبەر بەتیۆری مارکسیێتی و شێوەی بیرکردنەوەی شیوعییە کوردەکان هەبوو.

لە زۆربەی کتێبەکانیدا ئەو بیروبۆچوونەی دەردەبڕی و، پتر لایەنی بیری

نەتەوەپەروەریی نیمچە لیبرالی وەردەگرت، دەبێ لە ناوەرۆکی لیبرالیستیانەی بەرهەمەکانی مەسعود محەمەد ئاشنابین، کە ناوەرۆکی بیروڕاکانیەتی.

ئەو لە ساڵەکانی چلەوە ئەو دیدەی پەیڕەوکردووە. وەکو زانیومە... یەکەمین کێشەی فیکری مەسعود محەمەد، لە چلەکاندا، لەگەڵ یونس دلّداری شاعیر بووە، دانەری شیعری سروودی (ئەی ڕەقیب)، گوایە جیاوازیی سەرەکیی نیوانیان لەوەدایە کە یونس دلّدار لایەنگری بیرو هەڵوێستی نیشتمانی جەماوەری بووە، بڕوای بەخەباتی بەکۆمەڵ بووە، یاوەکو دەڵێن: گەلێری بووە (بڕوای بەخەباتی گەل، بەکۆمەڵ بووە)، بەلام مەسعود محەمەد بڕوای بەخەباتی تاک بووە، بڕوای بەپێشکەوتنی کۆمەڵ لە ڕێگەی پێشکەوتنی تاکەوە هەبوو، هەر بۆیەش لایەنگیری ئازادیی تاکەکەس (الحرية الفردية) بووە، ئەوەیە ڕیشەی لیبرالیزمی مەسعود محەمەد... کە هەڵوێستی ڕەخنەگرانەی لە شیوعییە کوردەکانی گەیاندە ئەوەی، لەگەڵ سەرهەڵدانی پرۆسترۆیکا لە یەکێتی سۆڤیەتدا، نامەیەکی کراوە بۆ (میخاییل گورباشۆف)ی ڕێبەری بزووتنەوەی پرۆسترۆیکا، بنووسێت، تێدا گلەیی لە شیوعییە کوردەکان بکات.

بزووتنەوەی ئەدەبی (روانگە) مونافەسەیەکی گەورەی لەنێوەندی ڕۆشنبیریی کوردا نایەوە، کە بەگشتی چاک و سوودمەندبوو، بەستەڵەکی دۆخی کلاسیکی شکاند، بواری شیعرو چیرۆک وتارو ڕۆژنامەو، دواتر شانۆو، دەربڕین بەگشتیی گرتەوە.

کەم نووسەرو ڕووناکبیری کورد هەنە کە لە کارێگەرێتی ئەو ململانێیە دەربازبووبن، ئەو تەکانە لە ساڵی ١٩٧٠ەوە ئیتر بەفراوانی گەشایەوە. بێگومان بواری ئازادیی دوای ڕێککەوتننامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ دەرفەتێکی چاکی بۆ نەشونمای جوولانەوەی ڕۆشنبیری ڕەخساند، جارێکی

دیکە ئاماژە بۆ گرنگێتی بوون، یا نەبوونی ئازادی دەکەم، بەڵام هەندێ جار تەنیا ئازادی مەرج نییە، بەڵکو بەخۆداچوونەوەی ڕەخنەگرانەی قووڵی دەوێ تا شەپۆلێکی نوێ هورۆژم بیات.

*** ئایا تەنیا ئازادی بەسە؟**

- ئەوەتا لە دوای ڕاپەڕینی ١٩٩١ەوە، سەرەڕای ئازادیی بەربلاو، یەکەم جار بۆ ١٤ ساڵی ڕەبەق، ئەمجاش کێشە و مونافەسەیەکی گەورە لەنێوانی قوتابخانە ئەدەبی و فیکرییەکاندا نابینین... ڕەنگە یەکێک لە هۆیەکانی ئەم دیاردەیە بەرەو پاشەکشێ و کزبوونی (ئەیدیولوجیزم)و باری شەڕی ناوخۆ، بگەڕێتەوە، لێ هۆیەکانی دیکە قووڵترو فراوانترن، لەوانەش زاڵبوونی جیهانگەریی ئابووری و سیاسی و ڕاگەیاندن. کۆمەڵگاکانی وڵاتانی دەوروبەریشمان، تووشی نەزۆکی ڕۆشنبیری بوونە، تەنیا قوتابخانەیەکی تازە کە هاتە ئاراوە (لە کوردستان بۆ نموونە) باسی پۆست مۆدێرنیزمە، ئەویش تا ئێستا یەکلایەنە دەخرێتە بەرچاو، لە ژینگەی ڕووناکبیریماندا ئێجگار تازەیە، تا ڕادەیەکیش تەماوی و ئاڵۆزکاوە، هێشتا، لێرەدا، بەرامبەرەکە (واتە ڕەخنە لێگرتنی) پەیدا نەبووە،، واتە: بەس وەردەگیرێت، کەسانێک پەیدا نەبوونە ڕەخنەی لێ بگرن، لەکاتێکدا لە وڵاتانی سەروچاوە، لە زێدو ماوای خۆی (وەکو ئەمریکا بەتایبەتی) پۆست مۆدێرنیزم، بەرامبەرەکەی هەیە، تەنانەت کەسانێک هەنە کە باس لە دوای پۆست مۆدێرنیزم دەکەن و، لەهەندێ بواریشدا بەرەو پاشەکشێ دەچێ.

وەهاش نییە کە لەو وڵاتانەدا، کەمن پۆست مودێرنێزم بووبێت بەمیتۆدی زاڵی سەرەکی کۆمەڵگاکان، بەڵکو هێشتا لە چوارچێوەی تاقمێکی هەڵبژاردەدایە.

پەیدابوونی جۆرە ئوسوڵگەرییەک، تەنانەت لە ئەمریکا و ئەورووپاش،

لەتەک گەڕانەوە بۆ ئایینی ڕوحانی و بۆ خێزان و ئەخلاقیات (بۆ نموونە تەماشای وتارەکانی جۆرج بوش بکەن کە نوێنەرێکی ئەو کەشوهەوا ئایینییە تازەی ڕووناکبیرییە...دەڵێم: پەیدابوونی ئەو دیاردانە، بەخۆی، نیشانەی ئەوەیە کە پۆست مودێرنیزم ڕەنگە زوو ڕەنگی کاڵەوە ببێت.

بێگومان، پۆست مۆدێرنیزم، وەکو تەوژمێکی فیکری گەورەو کاریگەر هاتە پێش و زۆرشتی گۆڕی... هەرچەندە ناتوانین ناوی فیکر یا فەلسەفە، یا قوتابخانەی ئەدەبی و سیاسی و هتد، لە پۆست مۆدێرنیزم بنێین، (بەخۆی بەوە قایل نابێ!)، چونکە ئەو تەوژمێکە لەهیچ قاڵبێکدا ناگیرسێتەوە، بەڵکو هەموو قاڵبەکان دەشکێنێ، تاپۆو پیرۆزمەندییەکان ورودوخاش دەکا، بەبێ ئەوەی شتێکی دیکە لە جێگەیاندا دابمەزرێنێ... پۆست مۆدێرنیزم هەموو سنوورێک دەشکێنێ و بەرد بەسەر بەردەوە ناهێڵێ، لە جیاتی ئەوە بەردێک لەسەر بەرد دانانێ، کەواتە: ئێجگار کاریگەر و ئەکتیڤ بووە لە شکاندنی بەستەڵەک و ڕووخانی تاپۆو سنوورەکان، لە گشت بواری ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتیدا... بزووتنەوە، (یادۆخی) جیهانگەری، ئەو جۆرە ڕۆخان و ڕماڵینەی لەلا مەبەست بوو، کە ئەوە نیوەی کارەکەیە. نیوەکەی تر بەپۆست مۆدێرنیزم چارەسەر نابێ، بەڵکو سیستەمی خۆبەخۆی جیهانگەری تەواوی دەکا و جیهانی تازەی ئازاد (سیاسەتی ئازاد، بازاڕی ئازاد، پێوەندیی و ڕاگەیاندنی ئازاد... هتد!) دادەمەزرێنێ.

ئێمە لەبەر ئەوەی لەدوا فارگۆنەکانی شەمەندەفەری شارستانی و کەلتوورو زانست، دانیشتووین، نە پۆست مۆدێرنیزەکە دەمانجوولێنێ، نە لە بەرامبەرەکانی ئاگادارین. هەربۆیەش جارێک هەڵگیرسانی کێشەی ناوخۆی ڕۆشنبیریمان دواکەوتووە... ڕەنگە وەختێکی تر، بەشێوەی تایبەتمەندی کۆمەڵگاکەمان، بزووتنەوەیەکی ڕۆشنبیری تازە شڵق بدات، هیچیش مەرج نییە لای ئێمەش کتومت وەکو جێگەیەکی دیکەی لێ بێت،

دونیا یەکدەنگ و یەکڕەنگ ناگۆڕێت، لێ کار لەیەک دەکەن، بۆ نموونە ئەمریکا لە ئەوروپای وەرگرت. بەڵام زیاترو دوورتر چوو، شتی تازەی داهێناو ئەوروپای بەجێ هێشت.

ژاپۆن لە ئەمریکای وەرگرت، بەڵام بەشێوەی تایبەتمەندی خۆیا ڕۆیشت و شتێکی دیکەی لێدەرچوو. ئەندونیسیا و مالیزیا و کۆریای باشوورو وڵاتانی دیکە، هەم لە ئەمریکا و هەم لە ژاپۆن وەریان گرت و، بەڵام بەڕێگەیەکی جیاوازا ڕۆیشتن.

ئەمریکا، بەر لە دوو سێ سەدە، زۆر شتی لە ئەڵمانیا وەردەگرت، تەنانەت بیناسازیش، هەروەها پەروەردە ئێستا ئەڵمانیا خەریکە لە ئەمریکا وەردەگرێت.

دیالکتێکی کارلێکردن و، وەرگرتن و ڕەنگدانەوە، لە سەرانسەری سروشت و گیانلەبەرەکانیدا بەبینادەمەوە، ئیمڕۆ بەشێوەیەکی گورجتر لە ژیانی کۆمەڵگای بەشەردا، خۆی دەنوێنێ.

ململانێی ڕۆشنبیری، لەبەر پاشەکشێی ئەیدیولوجیەت، لەلایەکەوە کز دەبێ، لەلایەکی دیکەوە گوڕ دەستێنێ، چونکە ململانێیەکە بەرەو (بنەڕەت) واتە: ئوسوڵگەرایی، دەچێت.

لە ئەسڵی وەڵامی پرسیارەکەتان دوورکەوتینەوە، کە مونافەساتی قوتابخانەی ڕۆشنبیریی کوردییە، بەکورتی: دەڵێم ململانێ، کە یاسایەکی سروشتییە، لە ژیانی ڕۆشنبیری ئێمەشدا هەر هەبووە، لە هەندێ بواردا کەم خایەن بووە، وەکو ئەو کێشە فیکرییەی کە عەبدولخالق مەعرووف، تێدا بوو بەقوربانی، چونکە سیستەمی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمە ستەمکار وتارێک بوو و زۆر زوو ئەو بیروڕایەی خنکاند.

یا وەکو ئەو مشتومڕە ئەدەبییەی لەگەڵ (مام هەژار)دا دەیانکرد، کە لە زۆربەی بەرهەمەکانی دوای ساڵانی ١٩٦٧ تا مردنی، ڕەنگی دایەوە، چ

لەشیعر یا لە پەخشان. ناوەرۆکی ململانێیەکە لەگەڵ هەژار، لە بناغەوە، نەبەس ئەدەبی بوو، نەبەس ئەوە بوو کە (هەژار) پەنای سیاسی و فیکریی بارزانیی نەمری هەڵبژارد بوو، بەڵکو مەودایەکی فراوانتری هەبوو، بیری نەتەوەیی و باری کۆمەلایەتی و پێگەی سیاسی و پێوەندی و ڕاگەیاندنیشی دەگرتەوە. مام هەژار هێمایەکی گەورەی ڕۆشنبیری بوو، ئەو دەیزانی کە مەبەست شەخسی خۆی نییە. بێباک بوو لەو ڕەخنە ئەدەبی و فیکرییانەی کە لە هەڵوێستی دەگیرا.

لێ ئەو زیاتر بەپەناگای ڕۆحیی خۆیەوە دەچەسپا... بارزانیی بەجێ نەهێشت، لەدوای کۆچکردنیشی بەجێی نەهێشت. هەر ساڵێک پارچە شیعرێکی تازەی لە یادی بارزانیی دادەنا هەندێ جار پەلی بۆ دیدی فەلسەفی قووڵ دەهاوێشت و مەسەلەی جەبرو ئیختیاری دەهێنایە پێش. ئەو لەو شیعرانەدا وەلامێکی دەدایەوە، کە گەوهەری هەر ململانێیەکی ڕۆشنبیرییە.

لێرەدا کەسایەتییەکی مێژوویی بووە بەتەوەری ململانێیە ڕۆشنبیرییەکە، لە جێگەیەکی دیکە دەمەتەقێ دەربارەی شێوەی لێکۆڵینەوە و دەرئەنجامەکەی دەبێتە تەوەر.

ئەو هەموو تەوەرو بابەتانە و، زیاتریش ئەگەر وردبینەوە، لە مێژووی کولتووریماندا (بەمانا فراوانەکەی) هەیە و دەبێت. فراوانترین ململانێی فیکری- سیاسی کە لە دە دوازدە ساڵی دواییدا لە کوردستانا سەری هەڵداوە دیالۆگ و مشتومڕی ڕاگەیاندنە لە نێوانی بیری سیاسی ڕزگاریخوازانە و دیموکراتخوازانەی بزووتنەوەی کورد لە سەرێکەوە و، بیری ئیسلامی سیاسی، بەتایبەتی توندڕەوەکەی، لەسەرێکی دیکەوە.

بەداخەوە ئەم ململانێیە بەگفتوگۆو لاپەڕەی ڕۆژنامەو بەرنامەی ڕادیۆو تەلەفزیۆن نەمایەوە، بەڵکو لەلایەنی دەستە توندڕەوەکانی ئیسلامی سیاسییەوە کار بەکوشتن و ڕاونان و ڕەنج و ئازار گەیشت.

ئەو ململانێیە تایبەت بەکۆمەڵگای کورد نییە، بەڵکو بەشێکە لە ململانێیەکی نێو نەتەوەیی فراوانە، تەواوی وڵاتانی گرتووەتەوە، بەتایبەتی وڵاتانی موسڵمان و، کردەوەی جەرگبڕانەی خۆتەقاندن و بەکۆمەڵ کوشتن و سەربڕین و تاوانی دیکەی لێکەوتووەتەوە.

وەکو ململانێی فیکری سەردەمی زاڵبوونی بزووتنەوەی کۆمۆنیزم، ئەم کێشە تازەیە، لە کوردستانا ڕەنگ و شێوەی کوردەواریی بەخۆ گرتووە.

ناتوانین لایەنەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی ڕۆشنبیری لێک جیا بکەینەوە، هەر لایەنێک کار دەکاتە سەر لایەنەکەی تر، لێرەشدا ململانێی بزووتنەوەی دیموکراتخوازی کوردو ئیسلامی سیاسی زوو بەزوو باڵی بەسەر لایەنەکانی دیکەی ژیاندا ڕاکێشا و، بوو بەتەوەرێکی ڕۆشنبیریی گرنگ، چونکە لە گەوهەردا مەسەلەیەکی فیکری و ڕۆشنبیرییە. ئەم ململانێیە لەنێوان دوو بۆچوونی بەرەی چەپ و لیبرالی دیموکراتی عەلمانی لە لایەک و دیدی پەیڕەوانی ئیسلامی سیاسی لەلایەکی دیکەوە، هەمیشە لە کۆمەڵگای کوردەواریدا هەبووە، هەندێ جار توندبووە، هەندێ جار سست و لاواز بووەتەوە، بەتایبەتی دوای هەڵایسانی شۆڕشی ١١ی ئەیلول ١٩٦١ کە تەوژمی نەتەوەیی دیموکراتی بەسەر هەموو تەوژمێکی دیکەدا زاڵ بوو، لێ ... ئیستا، لە دوای ڕاپەڕینەوە، زیاتریش لەژێر پاڵەپەستۆی باری نێودەوڵەتی و دۆخی وڵاتە ئیسلامییەکانی دیکە، ململانێیەکە توندو تیژتر بووە. ئەمەش کاتییە، چونکە لە چەند ساڵی داهاتوودا یا تەوژمی توندڕەوانەی ئیسلامی سیاسی بەتەواوی پاشەکشێ دەکات، یا چەندین شەڕی ناوخۆ وڵاتانی موسڵمان دەگرێتەوە. کۆنگرەی نێودەوڵەتی دژ بەتیرۆر کە لەم دواییە (شوباتی ٢٠٠٥ لە پایتەختی عەرەبستانی سعودی بەسترا نیشانەی توندوتیژبوونی ململانێیەکەیە لەناو وڵاتانی موسڵماندا، بەتایبەتی هەندێ دیاردەی ململانێیەکە سەیرن... بۆ نموونە: بەکەڵک وەرگرتن لە کەشوهەوای دیموکراتی و ئازادیی بیروڕا لە

کوردستانا، بەر لە ٦-٧ ساڵ، نووسەرێکی ئیسلامی سیاسی، بەکوردی کتێبێکی گەورەی نووسی، دەربارەی چی بێ؟! دەربارەی بێهوودەیی و زیانی (دیموکراسی)... دەیویست بڵێ ژیانی دیموکراتی خراپە و دژی ئیسلامە و دژی سروشتی ئینسانە، بەڵام بەخۆی نەدەسەلماند، کە ئەگەر دیموکراتی و ئازادی لە کوردستانا نەبا، نەیدەتوانی کتێبێکی وەها بنووسێت!!.

کەواتە چەمک و تەوەرەکانی ناوەڕۆکی ئەم ململانێیە مەیدانی ڕۆشنبیری فراوانتر دەگرێتەوە. لە چەندین دیالۆگی تەلەفزیۆنی و ڕۆژنامەگەری کە لە نێوان ڕۆشنبیرانی هەردوولادا بڵاوبوونەوە، پەل بۆ گۆشەو بواری تازەی ژیان و ڕۆشنبیری دەهاوێژرا.

ڕەنگە، لەم وەڵامە ڕۆژنامەگەریدا، نەمتوانیبێت خاڵ و لایەنەکانی ململانێ و مونافەساتی ڕۆشنبیری و سیاسی کوردستان بخەمە بەرچاو، چ بگات بەشیکردنەوە و دەرەنجام دەرهێنان! ئەم وەڵامە لە دەرنجامی پوختەوە دوورە، تەنیا هەوڵم داوە بڵێیم کە: بەڵێ! قوتابخانەی ئەدەبی و ڕۆشنبیریمان هەبووە و، مونافەساتیشیان لە نێواندا هەبووە. لێ لەبەر نەبوونی ئازادیی بەر لە ڕاپەڕینی ١٩٩١ و (لەبەر چەندین ساڵی شەڕی ناوخۆ و کرژو کاڵی) دەرفەتی پشکوتن و گەشەسەندنی دیالۆگی پێگەیشتووی فیکریمان نەڕەخساوە.

هێشتا مایەتی. ئێستاش بزووتنەوەیەکی ئەوتۆ بەرچاو ناکەوێت. دیارە وەختی دەوێ. من لە پێگەیەکدانیم بتوانم ئامۆژگاری و ڕێنومایی ئاراستە بکەم. هەرچی لەمەودوا بکرێت، ئیتر لە تواناو وزەی نەوەی کۆنماندا نەماوە، بەڵکو نەوەی نوێی دوای ڕاپەڕین، ئەوانەی لە کەشوهەوای ئازادیدا چاویان هەڵهێناوە، ئەوان دەتوانن سیما و خەسڵەتی بزووتنەوەی ڕۆشنبیریی و ڕەخنەگریی نوێ بنەخشێنن.

ناشتوانم ڕێنومای نەوەی نوێ ببم، بەڵکو ئەوان بەخۆیان دەبێ ڕێچکەی

خـۆیان بدۆزنەوە و تەخـتی بکەن. بەلای منەوە، نەوەی تـازە نابێ چاو لە ئێمە بکا... ئێـمە هیچ شتـێکی وەها بەرزمـان نییە تا لاسـاییکەری ئێـمە بن.

دەڵێم بەم نەوە نەومامە: چاوتان لە ئێمە نەبێ، بارودۆخی ئێمە ئێجگار سەخت و نائاسـایی بوو. لە ئێـمـە فـێـرنابن، بڕۆن، چاونەترس، ئاسـۆکـان بکوتن، دەشتە بەیارەکـان بکێڵن، کانیاوە شاراوەکان بدۆزنەوە، بەشێوازی تایبەتمەندی سەردەمی خۆتان بجووڵێنەوە و دابهێنن.

لەو چەند دێڕەدا ئـاماژەم بۆ گەورەترین مـونافـەسە و ململانێی ئێـستـا و ئاییندەی هەرە نزیکی نێـو کـۆمـەڵگام کـردووە، چ لە ئـاسـتـی فـیـکری و ڕۆشنبیریدا، یا لەمەیدانی بەکارهێنانی تەکنۆلۆژیای نوێ و تێگەیشتن لە شۆڕشی زانسـتی و زانیـارییەکـان و، شـارستـانی و ئاستی کـۆمـەڵایەتی و سیاسی و هی ترەوە.

ململانێ لەو بوارەدا قـووڵـترو فـراوانتـر دەبێت. هەمـوو لایەنێکی ژیان دەگرێتەوە، چونکە سروشـتـییـە، خواسـتی پێشـکەوتنە. بمبوورن کە لێرەدا بەزمـانـی حـەتمیـەتی داخـراو دەدوێم، من ئـالێـرەدا وەهای دەبینم، نـاتوانم زمـانێکی دیکە بەکاربهێنم. دەمـێنێـتـەوە (نەخشـەو پلان) بۆ مـونافـەسەی سروشتیی ئاییندە.

واتە: دەبێ هەلومـەرجی ئـازادی مـونافـەسە بخـولقێنن. ئازادی، بەخـۆی، دەرفەتی مونافەسەی ئازادو گەرم دەڕەخسێنێت. مونافـەسەی ئازاد ئەسڵ و گەوهەری ژیانی ئازادە، کۆمەڵگای ئازاد دەرفـەت و شەنسی پێشـکەوتن و سەرکەوتن بۆ هەر تـاکێکی کـۆمـەڵ فەراهەم دەکـات، ئیـتر دەمـێنێـتـەوە سەر تواناو لێـهـاتوویی و وزە و مـاندووبوونی هەرتـاکـە کـەسی: بێـگومـان مـونافـەسـە هەمـوو بوارەکـانی ژیانـی ئابووری و بـازرگـانـی و وەرزشی و خوێندن و ئەدەبی و هی تر، دەگرێتەوە.

بازاڕی ئازاد لێـوەشـاوەیی ئابووری و شـارەزایی تـاکـە کـەسـەکـان

دەسەڵمێنێت. لێ بوارێکی گرنگی مونافەسە بواری زانستی و داهێنانە. کۆمەڵگا، یا دەوڵەت و کۆمەڵگا، دەبێ دەرفەت بەهەرکەسێک فەراهەم بکات، تا بتوانێ لەداهێنانی هونەری و زانستی دا خۆی تاقی بکاتەوە و بیرۆکەکانی بەئەنجام بگەیەنێت و مافی پارێزراو بێت، هەروەها لە هەموو بوارێکی داهێناندا ئەو هەلومەرجە بۆ ئینسانە دابین بکرێت تا بتوانێ پڕ بەئارەزوو توانا و ژیانی خۆی، دابهێنێ و خۆی بنوێنێت.

ڕەخساندنی هەر بوارێکی داهێنان بەمانای ئازادیی و مونافەسەیە لە نێوانی داهێنەراندا، کەواتە: بۆ داهێنان و پێشکەوتن و دۆزینەوەی شتی تازە دەبێ چەندین مەرجی بنەڕەتی زامن بکرێن:

١- ئازادی... ئازادی بۆ هەمووان، هەرکەسێک ئازادبێ لە لێکۆڵینەوە و گەڕان بەشوێن زانیاری و پێویستیەکانی گەیشتن بەڕاستی.

٢- جگە لە ئازادی... دەبێ هەلومەرجی ماددی و مەعنەوی بۆ هەر داهێنەرێک جوور بکرێت، چ پارەبێ یا ژوورو تەکنۆلۆژیا و کەرەستەی لێکۆڵینەوە. لەولاتە پێشکەوتووەکاندا هەندێ لەو هەلومەرجە لە ڕێگەی کەرتی تایبەتی ناوەندو پەیمانگا و کارگەکانەوە، هەندێکی دیکەش لەلایەنی دامودەزگای دەوڵەتەوە، دەخرێنە بەردەستی داهێنەران.

ڕەنگە لەنێوانی چەندکەس، یاچەند دەزگا، مونافەسەی توند هەبێ دەربارەی ئەوەی کێ زووتر یا باشتر بەئەنجام دەگات، وەکو مەسەلەی دۆزینەوەی جینێوم لە ئەمریکا، کە لەدوو لادا، دووکەس، خەریک بوون، نهێنی(ژینەتیک) بدۆزنەوە، کە لە ئەنجامدا، دۆزینەوە زانستیەکە بۆ هەردوولا پێکەوە تۆمارکراوو هەردووکیان، لە ئەمریکا، بەداهێنەری ئەو دۆزینەوە زانستییە ناسران، یەکێکیان لەلایەنی دەزگای دەوڵەتەوە کۆمەک دەردا، ئەوی دیکەیان بەتوانای تاکەکەسی تایبەتی خۆی کاری دەکرد.

کەواتە: ڕێزنان لە ڕەنج و ماندووبوونی داهێنەر مەرجێکی بنەڕەتی

دیکەی مونافەسەی ئازادە، پاراستنی (مافی داهێنان) دەبێ بەیاسا بپارێزرێت و بەئەخلاقیات و زانستی و مافی مرۆڤەوەش، گرێ بدرێت.

٣- نەخشە و پلانی پێشکەوتن... کە مونافەسەی ئازادو، پاراستنی مەرجەکانی ئەم مونافەسە بەزانستی و ئەخلاقییاتەوە، مەرجێکی سەرکەوتنی ئەو نەخشەیەیە.

ئێمە لەم ولاتانەی خۆمان تەنیا نەخشەوپلانی ئابووریی (٥) ساڵەمان بیستووە، لەکاتێکدا میللەتانی زیندوو پلان بۆ هەموو بوارەکانی ژیان دادەنێن: بۆ ئابووری، خوێندەواری، تەندروستی، زانستی و داهێنان، خۆراک و ئاو و کانزاکان، ئەگەری ڕێژەی پیر و پەککەوتە و منداڵ و زاوزێ و... دەیان لایەنی دیکەی کۆمەڵگا.

میللەتانی پێشکەوتوو نەخشەو پلانی ژیانیان بۆ دەیان ساڵ دادەنێن، نەک تەنیا بۆ (٥) ساڵ، کە ئەویش بەتەواوی نابەینە سەر.

بۆ نموونە... ئیسرائیل و چەندین ولاتی دیکە نەخشە و پلانی (٥٠) ساڵەیان بۆ خۆ داناوە، ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پلانی (١٠٠) ساڵەی هەیە.

کۆمەڵگای کوردستان پێویستی بەهەرسێ بوار هەیە:

١- ڕەخساندنی هەلومەرجی داهێنان و مونافەسەی زانستی و هونەری و لێکۆڵینەوەی قووڵی زانستی بەرفراوانی توێژینەوەی زانستی، نەتەنیا لە بواری ئەدەب و جوگرافیا و مێژوو و ئابووری و مافناسی و دیموگرافی و هی تر، بەڵکو بەتایبەتی لە لقە زانستییەکانی دیکەدا وەکو: کیمیا و فیزیا و پزیشکی و کۆمەڵناسی و دەروونناسی و کشتوکاڵ و جیۆلۆجی و کانزایی و هی تردا.

٢- دەبێ سەرمایە و بودجەی زیاد، بەڕێژەی بەرز، بۆ پشتگیریی ماددی و مانەوی (مەعنەوی)و تەکنۆلۆژیی لێکۆڵینەوەی زانستی و داهێنان و

مونافەسەی زانستییانە تەرخان بکرێت، لەگەڵ ڕەخساندنی (ئازادیی لێکۆڵینەوە و داهێنان)، کە بەبێ ئەم ئازادییە وزە و توانا و بەهرەی ئینسان ناگەشێتەوە.

٣- دانانی نەخشەوپلانی درێژخایەن بۆ لێکۆڵینەوەی زانستی و داهێنان، بەلایەنی کەم بۆ ٢٥-٣٠ ساڵ، بەڵکو زیاتریش.

لەبەر ئەوەی هێشتا کوردستان لە چوارچێوەی عێراقدایە، ناچار دەبین خەڵکی عێراقیش لەگەڵ خۆمان پێش بخەین، واتە: دەبێ شتێک بکەین ئەو بیروبۆچوونانە لەمەڕ لێکۆڵینەوەی زانستی و نەخشەوپلانی درێژخایەن بخەینە مێشک و بەرنامەی کاری گشت خەڵکی عێراقەوە.

کەوایە، نابێ لە بواری مونافەسات و لێکۆڵینەوەی ئەدەبی و ڕۆشنبیریدا ڕابوەستین، بەڵکو بیر لە داهێنان و لێکۆڵینەوەی زانستی هەمەلایەنە بکەینەوە و، بەرەو ئەو ئاسۆیە پەل بهاوێژین کە بواری سەرەکی و ڕاستەقینەی پێشکەوتنە.

* بۆچی ئەم بایەخدانە بەشاکر فەتاح؟

- شاکر فەتاحی شەهیدم نەدیبوو، نایەتە یادم لە جێگەیەک، لە مەجلسێک لە بۆنەیەک، چاوم پێی کەوتبێت. ڕەنگە هەوڵی ئەوەشم نەدابێت، ئەگەریش ویستبام ڕەنگە بۆم ڕێک نەکەوتبێ. کەواتە: نەمدیوە. ئەمەیان گرنگ نییە.

لێ گرنگ ئەوەیە بۆچی بایەخم پێ داوە، هەروەکو، لە لای خۆمەوە بایەخم بەبەرهەمەکانی عەلائەدین سوجادی داوە بەبێ ئەوەی بیبینم، تەنیا یەک جار نەبێ لە مەجلسێکدا، ئەویش بەڕێککەوت. هەروەها گرنگیم بەنووسینەکانی مسعود محەمەد داوە کە تەنها دوای ڕاپەڕین ڕێککەوت چەند جار بیبینم و لەگەڵی دابنیشم. من هەندێ جار (ئەگەر زۆربەی کات نەبێ) لە خۆم تێناگەم. نازانم بەچی ڕێگایەکا دەڕۆم. چۆن دەفکرم... بۆچی

بەلای ئەم نووسەرا زیاتر دەڕۆم، بەلای ئەوی دیکەدا ناڕۆم. منێک، تا ماوەیەک و، ڕەنگە ئێستاش تاڕادەیەک، بەبیروڕای سیاسی چەپ و چەپڕەو چەپ بێن خۆبناسم، کەچی لە بەرهەمی ئەو نووسەرانەی چەپ نین، یا ڕەنگە دژی چەپیش بدوێن، چێژم وەرگرتووە. بەزمانی عەرەبی و فارسیش حەزم لێ بووە ئەو بەرهەمە ئەدەبیە ناچەپانەش بخوێنمەوە کە نووسەرانیان ئیدعای چەپخوانی ناکەن. لە ئەو پەڕی چەپڕەویمدا بوومە کە حەزم لە خوێندنی هەر شتێک بووە کە دژ بەبیر و ڕەفتاری بەرەی جیهانی چەپی سەردەمانی سەدەی بیستەم بووە. ئەدەبیاتی چەپیشم بەچڕی خوێندووە، بەڵام مێشکی خۆم لەوێدا دانەخستووە، بەڵکو هەمیشە وریا بوومە تا بزانم بەرەی بەرامبەر چی دەڵێت.

ڕەنگە بەشوێنی جۆرە هاوسەنگییەکی دەروونیدا گەڕاوم. سەیر ئەوەیە لە هەردوو لادا هەندێ ڕاستی و دروستیم بۆ ڕوون دەبووەوە. لێکم دەدانەوە، بەئەنجام نەدەگەیشتم. لەو سەردەمەدا (ساڵانی شەستەکان و هەفتاکان) کە بەبیروباوەڕی سیاسی، هەندێ جار، دەکەوتمە خانەی چەپی توندڕەوەوە، لێ لە هەمان کاتدا غەرقی خوێندنەوەی کتێب و پەڕاوە ئایینییەکان بووم تا بەسنووری جۆرە تەسەوفێک گەیشتم و، هەست و هزرە تەسەوفی و چەپڕەوی ئەو سەردەمە، ئاوێتەی هەست و بیری توندی نەتەوەیی کوردی، پێکەوە لە نووسینە بڵاوکراوەکانمدا دەربڕیوە لێکۆڵینەوە و ڕەخنەی نووسەرانی دیکەیان دەربارە هەیە. لە پاییزی ١٩٦٧ەوە، بێباک و بێ پەروا، بابەتی ئایینی و نەتەوە پەروەری و چەپڕەویم، پێکەوە لە یەک دەقدا دەنووسی و، بڵاوم دەکردنەوە. ئێستا من کامەیانم؟

من، دەبوا، لە بواری بیروڕای سیاسیدا، لەگەڵ مامۆستا جەمال نەبەز یەک نەگرمەوە، لێ لە بەرهەمە ئەدەبییەکانی و، تا ئێستاش لە شێوەی نووسینی چێژ وەردەگرم. شاکر فەتاح بەخۆی نەگوتووە چەپڕۆ، دیارە ڕۆژێکیش بەلای بیری چەپا نەڕۆیشتووە (کە جێگەی لێکۆڵینەوەیە) لێ

له دوای خوێندنی سەرەتاییەوە، خوێندنی خۆبەخۆی کوردیم له شاکر فەتاحەوە دەست پێکردووە. هەروەها عەلائەدین سوجادی و مەسعود محەمەد کە لە بەرەی چەپدا نەبوونە. وە نەبێ بەرهەمی نووسەرانی چەپڕۆم نەخوێندبێ. بەڵکو زۆریش هەوڵم داوە لێیان تێبگەم. هەندێکیان نەبێ، زۆربەیان هەوڵیان داوە پیشان بدەن کە چەپڕۆن، لەکاتێکدا چەمکی چەپ بەناخی دەروونیانا نەڕۆیشتووە تا ڕەفتاری هەمەلایەنەی ژیانیان چەپخوازی بنوێنێت.

شێوەی ژیانی مرۆڤ دەبێ ڕەنگدانەوەی بیروڕای تێدا دەرکەوێت، بۆ نموونە لە ئەوروپا پەیڕەوی ژینگەپارێزی، لەهەر کوێ بێ تەنانەت لە جلوبەرگ و قژ و ڕەفتاری دەناسرێت، جلوبەرگی پەیڕەوانی دیموکراتی مەسیحی، زۆربەی جار جیاوازە لە جلوبەرگی سوسیال دیموکرات و، بەئاسانی لێک جیادەکرێتەوە.

بیری چەپ تەوژمێکی سەرەکی کولتووری مرۆڤایەتییە، لەتەک تەوژمەکانی دیکەدا ڕیشەی بۆ دوو تا سێ هەزار ساڵ، بەڵکو زیاتر دەگەڕێتەوە، بیری چەپ هەمیشە بووە و دەمێنێ و بەشێکی سروشتیی بیرکردنەوەی هەندێ خەڵکە، چ زیاد یا کەم لەناو حزبی ڕاستڕۆشدا هەندێک جار باڵی چەپ یا چەپی مامناوەندی پەیدادەبێ. لە ئایینەکانیشدا بیری چەپ و بیری ڕاست پێکەوە هاتوون، هەمیشە ڕاڤەکەر (موفەسر)ی ئایینی وەها پەیدابوونە کە تێگەیشتنی چەپڕۆوانە یا ڕاستڕۆوانە بەئەم ئایینە یا ئەویتر دەدەن، تا لەگەڵ جووڵانەوەی کۆمەڵگا بگونجێت. لە بەرەی چەپدا، وەکو بەرەی ڕاست، لەرۆژهەڵاتدا نووسەرو شاعیری گەورە دەرکەوتوونە، لێ زۆربەی نووسەرە چەپڕۆکان لە داهێناندا سەرنەکەوتوون، چونکە لەناخەوە چەپ نەبوونە، بەڵکو ماسکی چەپیان پۆشیوە، لەکاتێکدا هەندێ لە ڕاستڕۆکان خۆیان بوونە و هیچی تر... پێویستییان بەماسک نەبووە.

ڕەنگە لەم بۆچوونانەم تۆزێک زێدەڕۆییم هەبووبێت، لێ بۆخۆم بەپێی تێگەیشتنم هەوڵم داوە لەهەردوو لایەن تێبگەم، لەهەردوو لا توخمی ڕاستی هەیە، بەڵام نەک هەموو ڕاستی، لە بیروباوەڕی ئایینی جۆربەجۆردا ئایدیاو بیرۆکەی بەرزم دیوە، هەروەکو لەهەندێ کولتووری چەپیشدا شتی جوانم بەرچاوکەوتووە... هەرچەندە هەمیشە جیهانبینینە قووڵە ئاینییەکە زاڵتربووە (لێرەدا ئایین بەمانای دینێکی ئەوتۆ بەکارناهێنم، بەڵکو وەکو گەوهەری پەیامی ئایین لە بەرەبەیانی مێژووی ئادەمیزادەوە کە مانای ویژدانەو خاکەڕایی و خۆشەویستی و میهرەبانی لەتەک ژیان و گەردوون و بوونەوەرەکانیدا، کە مرۆڤ زەڕەیەکی هەرە بچووکی ئەو دەزگا زەلامەی وجودەو لە ئەنجامدا بۆ ئەوێ دەگەڕێتەوە.

لەمەڕ هەوڵنەدان بۆ دیتن و ناسینی فیزیکی نووسەران تووشی سڵەمینەوە بوومە، چونکە هەندێ جار چاوم بەشاعیر یا نووسەرێک (یا سیاسەتمەدارێک) کەوتووە، کە لەوەوپێش زۆر حەزم لێ بووە بیبینم، بەڵام وەختێک لەنزیکەوە ناسیومە ئارەزووم بووە کاشکێ نەمدیبا! تەنیا لەدوورەوە ناویم ببیستبا و، لە بەرهەمەکانی چێژم وەرگرتبا. من هەرچەندە ئەو نووسەرە بەرچاوەنیم، لێ ڕەنگە کەسانێکیش هەبن دوای دیتنی من حەزیان کردبا ئەبەد منیان نەدیبا، بەڵکو لە دوورەوە منیان ناسیبا، ئەمە لە چییەوە هاتووە؟ ڕەنگە لەوەوە هاتبێت کە پرۆسەی خوڵقاندن جیایە لە لایەنەکانی دیکەی کەسایەتی ئینسان، کە بوونەوەرێکی هەزار لایەنەیە، لەڕووی کۆمەڵایەتی و فیکری و سایکۆلۆژی و دابونەریت و حەزو ئارەزوو و خولیاوە... هەمیشە شاراوە و نەناسراو دەمێنێ، کەس نازانێ لە چ خولەکێکدا چی شتێکی چاوەڕوان نەکراوی لێ دەوەشێتەوە. تۆ کە بەزەحمەت خۆت دەناسی و، ڕەنگە ئەبەد لەخۆت تێنەگەیت، چۆن دەتوانیت لە گشت لایەنی ژیان و هەست و هزرو حەزو ئارەزووی ئینسانێکی دیکە تێبگەیت، هەرچەند نزیکت بێ، لە خێزانەکەتیش بێ؟!.

سالی ١٩٧٢ کە گۆشەیەکی کورتی پەخشانم لە ڕۆژنامەی (التآخي) دەنووسی، ڕۆژێک لە بینایەی ڕۆژنامەکە لە شەقامی سەعدون بەرەو لای ڕووباری دیجلە لە بەغدا دانیشتبووم، دەمنووسی، یەکێک هاتە ژوورەوە، یەکەم جار بوو دەیبینم، بەڵام لەبەر وێنەکانی کە لە ڕۆژنامە بڵاومان دەکردەوە، یەکسەر ناسیمەوە، مامۆستا عەبدولمەجید لوتفی چیرۆکنووس و ڕۆژنامەنووس بوو، کوڕەکەی لە ڕۆژنامەکەمان بەرپرسی ئەرشیف بوو، بەدوای ئەوا هاتە ژوورەوە، بەگەرمی بەخێرم هێنا و خۆشحاڵیم لەم سەردانە دەربڕی، ئەو سەرەتا ڕاوەستا و گوتی: «سوبحانەڵلا! گەنج و قۆزی! لە خوێندنەوەی نووسینەکانت وەهام دەهاتیە بەرچاو پیرەمێردێکی ڕیش درێژی سپی بیت، سەد ساڵ ئەزموونی ژیانت لەپشتە، لە ئەشکەوتێکدا دانیشتووی بۆ خەڵکی دەنووسی و ڕێنماییان دەکەیت!».

گوتم: ئا ئەوەم کە لەبەرچاوت ڕاوەستاوم «گەنجێکی موو ڕەش و چوست و چالاک بووم»... بەڵام ڕەنگە بەدڵ پیربم!

ئەوە ئەو... ساڵ هات و ساڵ ڕۆیشت، دوای ٣١ ساڵ، جارێکی تر ڕۆژنامەی (التآخي)مان ڕزگارکردو، ئازادانە دوای ڕزگاربوونی عێراق ساڵی ٢٠٠٣، دامەزرایەوە و کەوتە بازاڕو شەقامی ڕۆژنامەگەریی بەغدا، من ڕۆژانە وتارم دەنووسی، هەندێکی بەئیمزای ئاشکراو هەندێکی بەنازناو، لێ زوو بەزوو لە کۆڕ و کۆمەڵەی ڕۆشنبیری و سیاسی بەغدا ئاشکرابوو کە منم ئەو وتارانە دەنووسم (چ بەناو یا بەنازناو)... و کەوتنە لێکۆڵینەوە لە کەسایەتیی ئەم نووسەرە!.

هەندێ کەس دەهاتن بۆ ئیدارەی ڕۆژنامەکە تەنیا بۆ دیتنم و ناسینم، لەپاییزی ئەو ساڵەدا (واتە ٢٠٠٣) گوتیان نووسەرێکی بەغدایی دەیەوێ چاوی پێت بکەوێ، گوتم: بابفەرمێ.

کە هاتە ژوورەوە، وەکو عەبدولمەجید لوتفی تۆزێک ڕاوەستاو ڕاما، ئەنجا گەرماو گەرم گوتی: (وامدەزانی گەنجی، چونکە تۆ بەشێوەیەکی

گەنجانە دەنووسی، نەمدەزانی پیرێکی مووسپی وەکو تۆ ئەو نووسینە گەنجانەیە دابهێنێ. پیرۆزباییت لێ دەکەم. دەستخۆش). پێکەنیم، دوای دانیشتن، قسەکەی عەبدولمەجیدم بۆ گێڕایەوە، گوتم: (لە لای خۆم سەیرترە کە ئەمە دەبینم. کە دوای پتر لە ٣١ ساڵ گەنجانەتر بنووسم، بەهەرحاڵ من ناتوانم خۆم هەڵبسەنگێنم، من خۆم نابینم، خەڵک دەمبینن، ئەوە بۆ ئێوە و خوێنەران دەمێنێتەوە، جا هەرچۆنم دەبینن ئەوە ئایدیای ئێوەیە، ڕەنگە وێنەی من لە لای خۆم جیاوازبێت لە وێنەکانی ئێوە، هەر کەس لە ئاوێنەیەکەوە و لە گۆشەنیگایەکەوە تەماشا دەکات).

جارێکی تر لەخۆم دەپرسم: من کامەیانم؟

ئایا ئەو نووسەرە گەنجەم ساڵی ١٩٧٢ بەشێوەیەک دەنووسم نووسەرانی دیکە وێنەی پیرەمێردێکی مووسپی و ڕیش درێژی ئەشکەوت نشین، لە مێشکیانا بۆم دەکێشن، یا ئەو نووسەرە بەساڵاچووەم ساڵی ٢٠٠٣ بەشێوەیەک دەنووسم بەهزری هەندێ نووسەر گوایە گەنجانە دەنووسم؟! من ئەو مرۆڤە بەهات و هاوارە چەپخوازەم؟ یا ئەو ئایین پەروەرە ئارام و بێدەنگەم؟

خزمایەتیم لەگەڵ ئەو نووسەرە ناچەپە کوردانە چییە کە ناوم هێناون، لەکاتێکدا هەوڵم داوە لاسایی گۆران و شاعیر و نووسەرە چەپڕۆکان بکەمەوە (کە لەمەشدا خۆم نەبێ کەس ئاگادار نییە)؟؟.... تێدا سەرنەکەوتم! سەیرو سەمەرەیە.

کەواتە: من کێم، یا وەکو جگەرخوێنی مەزن دەڵێ: کینە ئەم؟... کە دەشێ بڵێم: کیمە ئەز؟

ڕەنگە درێژەدانم بەقسە بۆ ئەوەش بێ، بەڵکو خۆم دەناسمەوە، لێ سوودی نییە! چەند فرەم ڕێستووە بەئەنجام نەگەیشتووم، هەندێ جاریش پەنام بۆ بێدەنگی و ڕامانین بردووە... بەڵکو خۆ بناسم، دیسان بێ سوود بووە!.

ئەم هێنان و بردنە، لەگێڕانەوەی هەندێ سەرگوزەشتەو دیدو بۆچوون، بۆ وەلامێکە دەربارەی پرسیارەکەت (بۆچی ئەم بایەخدانە بەشاکر فەتاح)؟، ڕاستی بێ، بەتەواوی نازانم بۆچی. مرۆڤ هەندێ جار (من وەهامە) بەدەنگی هەستێکی نادیاری دوورەوە دەچێت، نازانێ... بۆ؟! لەژیانی ئینساندا خولیاو خەیاڵ و هەستی شاراوە و تەماوی و نادیار زۆرن، کە هەندێ جار ئەوانە زاڵ دەبن بەسەر هزرو هەستی ئاشکراو دیارو شتی بینراوی بەرچاو، بۆچی؟... دیسانەوە نازانم.

بەدروستی نازانم، لەپڕدا، بۆچی بایەخم بەشاکر فەتاحی شەهید داوە، لێرەدا ئەگەر هەندێ هۆکارو بیانوو بهێنمەوە ڕەنگە هەر بۆ ئەوەبێ تا پاساوی بایەخپێدانەکە بدەمەوە و خۆمیش بەوە قەناعەت بهێنم! جا ئەگەر هەر دەبێ پاساو بۆ بایەخدانەکە بهێنمەوە ڕەنگە بۆ ٣ هۆ بگەڕێتەوە، بەکورتی:

یەک: لە پۆلی یەکەمی ناوەندی ساڵی ١٩٥٧ نووسینەکانی ئەو سەردەمەی شاکر فەتاحم خوێندەوە و کاری لێکردم.

دوو: تراژیدیای چارەنووسی ئەو ئێستاش ئەم پرسیارەی لەپێشم داناوە، کە شاکر فەتاح بۆچی خۆی بەدەستی ڕژێمەوە دا؟ بۆچی خۆی بەکوشت دا؟ خۆ دەیتوانی، بەرلەوە، خۆی بەبنکەی پێشمەرگە بگەیەنێت، ئیتر چیی بیەوێ، بیلێ!.

سێ: قوتابخانەی چاکسازی و میانڕۆیی شاکر فەتاح بۆ پەروەردەو چارەسەری دەردی کۆمەلایەتی، کەواتە ئەو لەسەر ڕێبازێکی تایبەتمەندی خۆی دەڕۆیشت و خاوەنی قوتابخانەیەکە لە کولتوورماندا.

ئەو سێ پاساودانە بڕێک شیکردنەوەیان دەوێ...

بەکورتی... من بەر لە چوونم بۆ قوتابخانە شیعری هەورامیم دەخوێندەوە. یەکەمین جار کە چاوم بەکوردیی سۆرانی کەوت لە ناوەڕاستی

پەنجاکان بوو، چەند دانە گۆڤاری (پەیام)ی کوردیم لە تاقی دیوەخانی خزمێک بەدەست کەوت، بەسۆرانی نووسرابوو، ئەمریکییەکان لە کەرکووک دەریان دەهێنا.

ساڵی ١٩٥٧ کە تازە چووبوومە ناوەندی، لە بەشی ناوخۆیی کەرکووک چاوم بەچەند دانەی گۆڤاری (هەتاو) کەوت، بەپۆستە بۆ قوتابییەکی هاوژوورم دەهات، هەر لەو ساڵەدا لەگەڵ قوتابییەکی خەڵکی چەمچەماڵ ئاشنابووم، بەناوی جەبار، بووین بەدۆستی گیانی بەگیانی. ئەو قۆناغی سەرەتایی بەکوردی خوێندبوو، (لەو سەردەمە لە چەمچەماڵ وەهابوو، بەڵام لە کەرکووک خوێندن بەعەرەبی بوو، لە سەرەتاییەوە تا دوا ئامادەیی... واتە من تەنیا بەعەرەبی خوێندبووم). ئەو برادەرە منی فێری خوێندنەوەی باشتری کوردی سۆرانی کرد، چەندین کتێبی کوردیی لەماڵەوە بۆ هێنام بەشەوقەوە دەمخوێندنەوە، لەیادمە کە هەندێکیان نووسراوەکانی ئەو سەردەمەی شاکر فەتاح بوو. ئیتر بەرهەمی ئەوم بەرچاو بکەوتبا دەمخوێندەوە، وەکو کتێبی: گەورە پیاوان، شەبەنگەبەرۆژ، هاورێی مناڵ، چیرۆک بۆ منالان و هیتر... زۆربەیان ساڵانی ١٩٤٧، ١٩٤٨ چاپکرابوون.

ناوی شاکر فەتاح لە مێشکما چەسپا، چونکە لە سەرەتای گرۆگاڵی رۆشنبیریدا بووم، حەزم لێ بوو هەموو شتێک بزانم، بەکوردی یا عەرەبی، ئەو چەند کتێبەی مامۆستا شاکر، لەو سەردەمەی نەوجوانیمدا، چمکێکی (گۆشەیەکی) پەردەی تاریکیی لەبەرچاوم لادا، لایەکی دنیای بۆ روونکردمەوە... لە رێگەی ئەوەوە یەکەمین جار ناوی کەریم خانی زەند و سەلاحەدین ئەیوبی و کرداره بەرزەکانی دەبیستم. لە (گەورە پیاوان)دا ئاگاداری رەنج و داهێنان و گەورەیی چەندین بلیمەتی ئەم چاخە دەبم: وەکو، ولبەر فورس (لابەری بازرگانیی قولەرەش)، بیل، داهێنەری تەلەفۆن، نانسن پاڵەوانی جیهان لە پیاوەتیدا کە خەڵکی نەرویجە،

گـۆتەمـبـەرگ داهێنەری چاپی نوێ، کـولومـب (کـولومـبس) دۆزەرەوەی ئەمریکا، سەپسن داهێنەری بێـهـۆشدار و، مـارکۆنی داهێنەری تـەلگرافی بێتەل، گاندی و گەورە پیاوانی دیکە.

شاکر فەتاح لە نووسینەکانیدا، ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ هانی لاوانی کوردستانی دەدا بۆ داهێنان و پیاوەتی و خزمەتی گەل و فێربوون و وەرزن (وەرزش) و خووڕەوشت و دابونەریتی چاک. کـۆمـەڵە چیـرۆکـەکـانی بۆ منالان و، بۆ پێکەنین، زاخاوی مێشکی ئێمە بوو لەو دەمەدا. سادە و ڕەوان دەینووسی. بابەتی پڕ لە مـاناو سـوودمـەندی بەشێوەیەکی جوان و روون دەخستە بەردەستان. ئەو شێوە سادەیە لە نووسیندا پتر منی هان دەدا کـە منیش بنووسم، وەکـو ئەوەی پێم بڵێ: بنووسـە! تۆش دەتوانیت بنووسی!.

لێرەوە دەچمە سەر ئەوەی کە ناوی (قـوتابخـانە) بەمـانای مـەکـتـەبی ئەدەبی یا ڕۆشنبـیـریی شـاکـر فـەتاحی لێ دەنێم. ئەو دیارە لە سـەرەتاوە ئامانجێکی بۆ خۆی دانابوو، هەم بەنووسین هەم بەکردەوە، لە ڕێگای ئەرکە کارگێڕییەکانییەوە لە شارەوانی و لە قائیمقامیەت، خزمەتی گەل بکات. دیارە خۆی لە شەڕو هەرای حزبی و سیاسی دوور ڕاگرتبوو، تەنیا لە ساڵی ١٩٧٤ بەدواوە تۆزێـک خلسکایە نێـو هەڵوێسـتـێکی نەباشی سیـاسی، ئەویشی بەخوێنی خۆی پاک کردەوە (دێمەوە سەر ئەم خاڵە تراژیدییە).

ڕێبازی قوتابخانەکەی بەو دوو ڕێگایە ئەنجام دەدا: یەک، بنووسێت، چ وتار، کـتـێب، یارۆژنامـەی دیدار (وەکـو باسـەرە، خـورمـاڵ، چەمـچەمـاڵ، ئاکـرێ)، لە ڕێگـای نـووسـینەوە تـاک و کـۆمـەڵ پەروەردە بـکـات، بیروبۆچوونی چاکسازی و پێشکەوتنی هەنگاو بەهەنگاو (گاف بەگاف) بڵاو بکاتەوە. ئەو (شـۆڕشـگێـڕ)، بەچەمکی ئێـمـە نەبوو، بەڵـکـو ریفۆرمیست (چاکساز) بوو. جارێک ڕەخنەیان لێ گرتم، گوتیان تۆ بایەخ بەشاکـر فـەتـاح دەدەیت لە کـاتێکدا ئەو (اصـلاحی)یە، گـوتم هەر لەبەر

ئەوەیە کە بایەخی پێ دەدەم. چونکە ئەو بەر لە هەموومان دەرکی ئەوەی کردبوو کە پێشکەوتنی هەنگاو بەهەنگاو (نەشۆڕشگێڕانەی توند) لەسەر بنەمای پەروەردە و چاکسازی و پێشکەوتنی زانستی و پیشەسازی و دروستکردنی باخچە و قوتابخانە و یانە و بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیری باشترە.

**دوو:** بەکردەوە لە هەرکوێ ئەو فەرمانبەر، یا بەرپرس ببا، هەوڵی دەدا شتێکی شارستانی بەدی بهێنێ، وەکو دەرکردنی ڕۆژنامە، چاککردنەوەی هاوینە هەوار (وەکو لە ئاکرێ بۆ نموونە)، یاریگەی وەرزش و چالاکی کۆمەڵایەتی بۆ نەهێشتنی گرفت و کێشەی ناو خەڵکی ئەو دەڤەرانە. ئەو خاوەنی پەیامێکی کۆمەڵایەتی ڕۆشنبیری بوو، بەهێمنی و ئارامی بەشێوەی خۆی ئەنجامی دەدا. هەوڵی دەدا، منداڵ و جوان و لاوی کورد هەموو شتێک بزانن، هەر بۆیەش ژیان و بەرهەمی دەیان داهێنەر و زانا و چاکسازی جیهانی بۆ زمانی کوردی وەردەگێڕا، یا پوخت و کورت بەخۆی دایدەنا تا چاوی کورد بکاتەوە ئەو بەتاکی تەنیا زۆر بلیمەت و دانا و داهێنەری دنیای بەکورد ناساند وەکو، زەردەشت، بوودا، ڤۆلتێر، کۆنفوشیوس، مەدام کوری، ئەفلاتون، میکائیل ئینجیلا، مۆزارت، سوقرات، گاریبالدی، گاندی، مونتیسکو، جان جاک ڕوسو.

... هەروەها پیاوە گەورەکانی کورد و شاعیرانی دەناساند، وەکو سەلاحەدین ئەیوبی، کەریم خانی زەند، مەم و زینی خانی، حاجی قادری کۆیی، زێوەر، بێکەس و شاعیر و نووسەرانی دیکە. ئەمجا بایەخی گرنگی بەخواپەرستی و ئایین پەروەری دەدا، لە مەشدا هەوڵی دەدا خوێنەرانی پەروەردە بکات. وەکو دەردەکەوێ لە چوارچێوەی دیدێکی چاکسازانەی هێمن بەرهەمەکانی نووسیوە، بڕوای بەهێزی بیر و زانین و ڕۆشنبیری هەبووە. ئەو ڕووبەڕووی چەندین ئاستەنگ بووەوە، لەوانەش کەمی تیراژی (دانەی چاپکراوی) کتێبەکانی. ئەمجا نەبوونی ئازادی،

هەر بۆیەش ناوبەناو شتی بەکۆمەڵ بڵاوکردۆتەوە. ساڵانی ١٩٤٧، ١٩٤٨ ئەمجا ساڵانی ١٩٥٩، ١٩٦٠ دواجار لە ساڵی ١٩٦٧ ەوە (دوای ئازادییەکی سنووردار بەهۆی ڕێککەوتنی ٢٩ ی حوزەیرانی ١٩٦٦ لە نێوان بارزانیی نەمر و حکومەتی عێراق)... بێگومان باری ئابووری خۆی ڕێگەی نەداوە لەوە زیاتر چاپ و بڵاوبکاتەوە. ئەگەر بەرهەمەکانی لە کات و ڕۆژی خۆیدا بەتیراژی زیاد و بەئازادی بکەوتبایە دەستی منداڵ و نەوجەوانان و گەورەکانیش، بێگومان تەئسیرێکی ئێجگار گەورەتری دەبوو.

لە سەرێکی دیکەوە ڕووناکبیرانی گەورە، وەکو ئەو، تووشی هەمان دەردیش دەبن کە من ناوی (دیکتاتۆرییەتی داوکەوتن و نەزانین و نەفامی)ی لێ دەنێم. من کە خۆم بەخاوەنی شتێکی ڕۆشنبیری ئەوتۆ نازانم... لێ دەزانم ئەو دیکتاتۆرییەتە چەند سەختە. ستەم و دیکتاتۆریی ڕژێمە سیاسییەکانی بەلامەوە هیچ نەبوونە، چونکە زانیومە چۆن ڕووبەڕوویان ببم، یا هیچ نەبێ خۆم حەشار بدەم یا بچمە سەنگەری پێشمەرگە. لێ، دیکتاتۆرییەتی دواکەوتنی کۆمەڵگاکەی خۆم بارێکی ئێجگار گرانە، چونکە ناتوانین شەڕی ئەو خەڵکە بکەین کە هاتووینە خزمەت و ڕزگاریان بکەین، لە کاتێکدا هەندێ لەو خەڵکە نە لە بەرژەوەندی خۆیان تێدەگەن، نەڕێگە دەدەن یارمەتییان بدەین، بەڵکو کۆسپ دەخەنە ڕێ.

دەردی ستەمی دواکەوتن و نەفامی هەندێ خەڵکی دەردێکی بێ دەرمانە مەگەر زەمەن هەندێکی چارەسەر بکات، ئەو جۆرە ستەمە بۆ کەسانێک وەکو شاکر فەتاح سەخت و گرانە، چونکە بەقووڵی هەستی پێدەکەن.

لێرەوە دەچمە سەر هۆیەکی دیکە کە پاڵی پێوە ناوم پتر بایەخ بەشاکر فەتاح بدەم، ئەویش چارەنووسە تراژیدییەکەیەتی. ئەو نزیکەی ٧٥ ساڵ

ژیا، ڕۆژانی ئەخـیـری تەمـەنی ئەوەندە پرشنگدارە کـە تاریکی هەمـوو تەمەنی ڕەواندۆتەوە.. نەک لەبەر ئەوەی بەدەستی ڕژێم شەهیدبووە، بەڵکو پتر لە بەرئەوەی کە بۆچی و چۆن خۆی بەدەستی خۆی، دیاریشە بەئاگایی بەو چارەنووسە گەیاندووە.

لە یادی ١١ی ئاداری ١٩٨٨ لە پڕدا، ئەوکـە تەمـەنی بە ٧٥ سـاڵ گەیشـتبوو، بەگژی ڕژێمێکی دڕندەو ستـەمکار و کـوردکوژ وەکـو ڕژێمی بەعس و سـەدامـدا ڕۆیشت. ئەو لە ڕواڵەتدا داوایەکی سـادەی لە ڕژێمی بەعس هەبوو (کە لە کۆڕێکی فراوانی هەولێـر خـوێندییـەوە). ئەو داوای کرد ڕژێم لەگەڵ پێشمەرگە (واتە: بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد) گفتوگۆ بکات، ئاشتی بەرقەرار بێت.

دوو شتی بەڕواڵەت بچووک، بەڵام لە گەوهەردا مەزن و قووڵ و سەرەکی بوون، یەک ئاشتی، دوو- ئاشتی لەگەڵ پێشمەرگە (سومبولی مەقاوەمەتی خـەڵکی کـوردسـتـان). ئەو ئاشـتـیـخـوازییـە لە ١١ی ئاداری ١٩٨٨دا گەورەترین جەنگ بوو لەگەڵ حکومەتی سەدام، لە چ ڕوویەکەوە؟!... بەڵێ لەڕووی ئەوەوە کە شـاکر فـەتاح وەکـو بڵـێت: شـەڕی جینۆسـاید دژ بەکورد دروست نیـیـە، ڕایبگرن دەبێ بەئاشـتی لـەگەڵ پێـشـمـەرگـە ببڕێتـەوە. ئەو بەئاشکرا سنگی نایە سنگی ڕژێمێکەوە تازە خۆی بۆ کورد قڕان و ئەنفال و کیمیاباران ئامادە دەکرد.

لە مـێـژووەکـە وردببنەوە. شـاکـر فـەتاح بەبۆنەی ١١ی ئاداری ١٩٨٨ بانگی ئاشـتیی لەگەڵ پێشـمـەرگە هەڵدا. ئەمما کـیـمـیـابارانی هەڵەبجە لە ١١/ئاداری ١٩٨٨، واتـە چەنـد ڕۆژ دوای بانـگەوازەکــــەی ڕووی دا. شاڵاوی ڕەگـەزپەرسـتـانەی ئەنفـال لە ناوەڕاستی نـیـسـانی ١٩٨٨ دەسـتی پێکرد کـە تا ٢٥-٢٩ی مـانگی ئابی هەمـان سـاڵ بەردەوام بوو. ئەو بەر لەو کارەساتانە شەهیدبوو (ڕژێم گرتی و کوشتی). کەواتە: تۆ بڵـێی شاکر فەتاح هەستی بەو کارەساتانە نەکردبێت، کە خەریکە ڕوودەدەن؟ بێـگومان

ئاگای لە توندوتیژبوونی شاڵاوی جینۆساید دژ بەکورد هەبووە، کە هەر لە نیسانی ١٩٨٧ەوە کیمیاباران، کەم و زۆر دەستی پێ کردبوو، جگە لە وێرانی و کاولکردنی هەزاران گوند و شارۆچکە.

ئێستا ناتوانین بزانین لەو سات و کاتەدا کە ئەو بانگەوازەی هەڵدەدا، شاکر فەتاح چۆنی بیر دەکردەوە: ئایا نەیدەزانی کە مانای قسەکەی چییە؟ دەبێ زانیبێتی. ئایا نەیدەزانی چ چارەنووسێک بەدەستی ئەو ڕژێمە چاوەڕوانیەتی؟ دەبێ ئەوەشی زانیبێ. تۆ بڵێی هەستی بەکارەساتەکانی دیکەی کردبێ و نەیویستبێ ئیتر ئەو تاوانانە ببینێ؟! ئەی چی؟! چۆنی لێک بدەینەوە؟.

شاکر فەتاح ساڵی ١٩٧٤ قبووڵی کرد لە ئەنجومەنی تەشریعی و تەنفیزیی حوکمی زاتیی سەردەمی بەعس دابمەزرێت. ئەم هەڵوێستەی بێگومان نەدەگونجا لەگەڵ سەراپا پەیامی کولتوورەکەی کە هەمیشە هانی گیانی نیشتمانپەروەری و کورد پەروەری و ئازادی و پێشکەوتنی دەدا و، لاوانی بەو گیانە پەروەردە دەکرد. تۆ بڵێی دوای هەڵسەنگاندن، ئەو هەڵوێستەی ساڵی ١٩٧٤ی لە لا سەخت و گران بووبێ و ویستبێتی لەو مێژووە ڕزگاری ببێت، هەر بۆیەش خۆیی بەکوشت دا؟ زۆرم پرسیارکرد لە ئاشنایانی، نەمزانی کە بۆچی لە ١٩٨٨ دا بەگژی ڕژێمدا چوو؟ هەرچی بێت ئەو لە گیانی ڕەسەنی نیشتمانپەروەرییەوە خەمی گەلی کوردی خواردووە و داوای ڕاگرتنی شەڕوماڵوێرانی لە ڕژێم کردووە و، بانگی ئاشتی و ئاشتبوونەوەی لەگەڵ پێشمەرگە (بەرزترین سومبولی خۆڕاگریی گەلی کوردستان) هەڵداوە. بەڵگەی بڕیارە دروستەکەی کە نیشتمانپەروەری بووە، ئەوەیە کە ڕژێم لێی قبووڵی نەکرد، گرتی و وەکو دەڵێن بەئەشکەنجەیەکی قورس شەهیدی کرد.

ئەمجا لە هەموو گرنگتر، شاکر فەتاح، بەتەنیا و بێ پشت بەستن بەهیچ حزب و لایەن و کەسێک ئەو ڕاپەڕینەی بۆ خۆی بەرپاکرد. چونکە

بیســتــوومــه لەو کــاتەی گــەڕایەوە مــاڵ و ئیــتــر زانی کــە دەیگرن، هیچ هەوڵێکی نەداوە تا هەڵبێت. لە هیچ حزبێکی کـوردسـتـانیی گـۆڕەپانی خەباتی ئەو سـەردەمـەش داوای نەکـردووە ڕزگـاری بکەن و بیبـەنە چیـا. ئێستاشی لەگەڵ بێت هیچ حزبێک نەیگوتووە کە شاکر فەتاح لەو دەمەدا پێوەندیی پێوە کردوون تا یارمەتیی بدەن. خۆی بەتاک و تەنیا چووبووە مەیدانی نەبەرد دژ بەو قەلا سەختەی ستەم و دیکتاتۆری.

لە شیکردنەوەیەکی دیکەشدا گـوتم: کـە شـاکـر فـەتاح وەکـو سـوقـراتی فـەیلەسـوف بەهێمن و ئارامی چاوەڕوانی (سزا) بووە. سـوقـرات بەدەستی خــۆی ژاری نۆشی (بڕیاری لە سـێــدارەدانی بەو جــۆرە بووە، دەیتــوانی هەڵبێت، بەڵام لە بەندیخانە مایەوە) شاکر فەتاحیش بەسەربەستی خۆی قسـەیەکی ئاشتـیخوازانەی گوت و دانیشت تا بیبـەن و بیکوژن. هەروەکـو ئەوەیە بەدەستی خۆی ژارەکەی نۆشیبێ.

ئەو ڕووناکبیرێکی مەزنە. لە بەر بیروڕای نیشـتمانپەروەری شەهیدبوو بەلای منەوە شاکر فەتاح گەشترین سومبولی قوربانیدانی ڕووناکبیرانی کــوردە. قــوربانیــدانەکــەی لەگــەڵ گــەوهەری نووسین و بیــروبۆچوونە ئەسڵییەکانی، دەگونجێ.

*** لەبارەی بیـرەوەرییـەکـانت لـەگـەڵ ئیـدریس بارزانـی هـەمـیـشـە زینـدوو، چـی دەڵێیـت؟**

- بیرەوەری زۆرن، کامەیان؟

ڕێگەم بدە لەسەر ڕواڵەتی ئاخافتن دەربارەی هونەری نووسین و هزرڤانی بەشێک لەبارەی بایەخدانی ئیـدریس بارزانی بەنووسین بگێـڕمـەوە، ئەو منی بەئاگا هێنایەوە کە شێوەی نووسینم باشـتـرە لەشێوەی قسـەکـردنم، سـاڵی ١٩٧٧ ڕۆژێک لەپڕدا بەهێـمنی و بەپێکەنینەوە قسـەی پێ بڕیم و گوتی: (پێت بڵێم ئەم شتانە بخەرە سەر کاغەز تا پێکەوە بیخوێنینەوە و

بڕیاری لەسەر بدەین، تۆ کە دەنووسی باش ڕوونی دەکەیتەوە و ئینسان بەچاکی لێت حاڵی دەبێت، کە قسە دەکەیت هەندێ جار تێکی دەدەیت، بنووسە، زیاتر زیاتر بنووسە کەمتر قسە بکە). تا ئەو وەختە هەستم بەو شێوازەی خۆم نەکردبوو، وەهاش دەرکەوت ئەوەی کە بۆ دەربڕین پێویستی بەنیو سەعات قسەکردنی زارەکی دەبوو بەنزیکەی ٥ دەقیقە بەڕێکوپێکی دەمنووسییەوە.

ئیتر لەوە بەدواوە ئەو بۆچوونەی ئیدریس دەربارەی نووسین و قسەی زارەکی من بوو بە کلیلێکی پێوەندی نێوانمان، بۆ نموونە لە حاڵاتی پەستی، یا هەڵچوونی من، ئەو بەپێکەنینەوە دەیگوت: (بەسە لێرە ڕاوەستە، خەریکی تێکی دەدەیت، بڕۆ بینووسە، چی دەنووسی بنووسە، لەسەری قسەی دەکەین). من نەریتێکی خراپم لە ئاخافتندا هەیە، بەتایبەتی لەکاروباری جیدی سیاسییدا، هەندێ جار تووڕە دەبم، پەست دەبم، تێکەڵاوی دەکەم، مەبەستەکەم لەنێواندا بزر دەبێت، بەرامبەرەکەم لەجیاتی جەوهەری قسەکەم پەڕی پەراوێزێکی لاواز دەقۆزێتەوە و لە مەبەست دوور دەکەوێتەوە، لە نووسیندا مەبەستەکان چڕوپڕن، هەرچەندە توندوتیژیش بمنووسیبا، ئیدریس دەیگوت: ئێستا لێی حاڵی بووین، باشە، لەئەوەندەی لەگەڵتاین، لە ئەوەندەش نەخێر! یا هەموویانی قبووڵ دەکردو لەکۆبوونەوەکان پشتگیریشی دەکردم، یا هەمووی ڕەت دەکرایەوە. ئەو لە پەستبوون و تووڕەبوونی من بێزار نەدەبوو چ بەتەنیا بباین یا لەناو کۆبوونەوە و دانیشتنی خەڵکیدا، دواجار زۆربەی هەڤاڵان ڕاهاتن لەسەر ئەوەی کە شێوەی توندی دەربڕینەکانم قبووڵ بکەن، هیچ نەبێ، ڕەنگە لەبەر ئەوە بووبێت کە بەو قەناعەتە گەیشتبن نیازم پاک بووە.

ساڵی ١٩٨٥، جارێک وەکو هەمیشە وتاری سیاسی ڕۆژانەی ڕادیۆی دەنگی کوردستانم دەنووسی، لەپڕدا قەڵەمەکەم داناو کەوتمە بیرکردنەوە: (ئۆتۆنۆمی ڕاستەقینە؟!... یانی چی؟ ئەم هەموو قوربانیدانە بۆ

ئۆتۆنۆمی؟... ڕۆژانە بەهەرشێوەیەک باسی ئۆتۆنۆمی ڕاستەقینەمان لە رادیۆ دەهێنایەوە، بوو بوو بە(یەخنی!)... لەم وشەیە پەست و بێزاربووم. فیداکاریی پێشمەرگە و قوربانیدانی جەماوەر لە رادەبەدەر بوو، کەوتمە (بیر)ی تێفکرینەوە، پێداچوومە قوولایی.... بەوە گەیشتم کە باشترە داوای شتێکی زیاتر بکەین، سەربەخۆیی تەواو مافی خۆمانە، ئەگەریش لەم بارودۆخەدا نەتوانین بەئاشکرا جاڕی بدەین، دەبا هیچ نەبێت داوای (فیدرالێزم) بکەین.

بەم ئامانجە بڕێک حەسامەوە، تەزوویەکی لەزەتبەخش بەدەروونما هات، بەخۆم گوتم: باشە! فیدرالیزم!... ئیتر لەو وتارەدا باسی ئۆتۆنۆمیم نەهێنایەوە ئارا، بڕیارێکی نهێنی بوو لەنێوان خۆم و کاغەزەکەدا، لەجیاتی ئۆتۆنۆمی تەنیا (مافە ڕەواکانی کورد)م نووسی، وتار ڕۆیشت و خوێندرایەوە و پەخش بوو، یەک دوو هەڤاڵ لە لقێکی دوور لەبارەگای ڕاگەیاندن، هەستیان بەو جیاوازییە بچووکە کرد، بروسکەیان بۆ ناردم: مەسەلە چییە؟

ڕۆژی دوایی لە وتاری ڕۆژانەی ڕادیۆدا دروشمی ئۆتۆنۆمیم وەک خۆی هێنایەوە و لەو هەڵەیە پەشیمان بوومەوە، چونکە مافی من نییە، سەربەخۆ دروشمی بزووتنەوەیەکی سیاسی بگۆڕم، لەگەڵ خۆم ئەو پەیمانە نهێنییەم بەست، لە رادیۆ و چاپەمەنی با دروشمی ئۆتۆنۆمی وەکو خۆی بڕوات، بەڵام لە مەکتەبی سیاسی و کۆمیتەی ناوەندی پارتی بەئاشکرا باس لەم گۆڕانکارییە دەکەم... کە من ئیتر فیدرالێزم بەدروشم دەزانم. ئیدریس، بەر لە هەڤالانی دیکە، چاوی بەبروسکەی هەڤالانی لق کەوتبوو، لە یەکەمین دانیشتندا پرسی: مەسەلە چییە؟ وەکو خۆی چۆن بوو، وەها گێڕامەوە، گوتم: ئۆتۆنۆمی لە لای من ئیتر مردووە، لە کۆبوونەوەش باسی دەکەم، دەزانی چی گوت؟ گوتی: خۆزگە منیش وەک تۆ ئازاد بیام!.

نووسراوه، مەبەستم لە گێڕانەوەی ئەم (داستان)ە، ئەوەیە کە ئیدریس یەکەمین کەس بوو کە پشتیوانی لێکردم تا ئەو دەقە لە کۆنووسەکە بنووسرێت، نەشمزانی بۆچی ئەوەندە بەگەرمی پشتگیریی لەو پێشنیارە دەکرد، لە یادمە کە ئەو پرسیارەم لێی نەکردووە: بۆچی؟ وەکو بلێی لە دڵەوە ئاگاداربووم کە مەبەستی چی بووە. من لە یەک شتی گرنگ ئاگاداربووم، کە ئیدریس بارزانی باوەڕی بەمەسەلەی ئۆتۆنۆمی نەبوو، ئەو چاوەڕوانی بارودۆخێکی دیکەی عێراق و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی دەکرد. ساڵی ١٩٨٠ لەماڵی خۆیان، پێکەوە، ئەو و د. محەمەد ساڵح جومعە و من، دوو شەو و ڕۆژ چەندین جار بەدرێژی دانیشتین، بەدارشتنی پێوەندی دەرەوەی پارتییەوە خەریک بووین، ئەو وەختە ئیدریس بەبەرپرسی (بەشی ناوەندیی) پێوەندیی پارتی دانرابوو، د. محەمەد جومعە و من ئەندام بووین، لەو لێکۆڵینەوانەدا ئیدریس درکاندی کە قەناعەتی وەهایە مەسەلەی کورد هێشتا ماویەتی سەرهەڵبدات، گوتی: لە ساڵانی ١٩٩٠ بەدواوە، واتە لە نەوەتەکانەوە ئیتر مەسەلەکە دێتە پێش، سەرهەڵدەداو، ڕەنگە ببێت بەگرنگترین کێشەی ڕۆژهەڵات، (ئەوەی لە ساڵی ١٩٨٠ دا گوت، چاوەڕوانیی نەوەتەکان بوو). لە وەلامێکی ڕۆژنامەی (النهار)ی لوبنانیدا ئەو قەناعەتەی دەربڕیبوو، نووسیبووی ڕەشنووسەکەی پێشان داین، بەلام دیارە وەلامەکەی نەناردبوو، یا من چاوم بەو ژمارەیە (النهار) نەکەوتووە.

ئیدریس دووربین و واقعبینیش بوو، زۆر وریای ئاخافتن و جموجۆڵی خۆی بوو، دەیزانی کە پایتەختەکانی دەوروبەر و حزب و هێزە سیاسییەکانی عێراق و ناوچەکە، هەروەها پایتەختە گەورەکان، هەموو پیت و وشە و هەڵوێستێکی دەخەنە ژێر زەڕەبین و بەوردی هەڵیدەسەنگێنن، هەر بۆیەش، بەتایبەتی دوای سەفەری مستەفا بارزانیی نەمر(١٩٧٦)، بۆ چارەسەری تەندروستی لە ئەمریکا، گوشاری حکومەتی

مەبەستی ئەوەبوو، کە ئەو، بەرپرسی پێوەندیی گشتی و بەرپرسی کاروباری کۆمەڵایەتی و ژیانی دەیان هەزار ئاوارە و پەنابەر و پێشمەرگەبوو، زیاتر لە هەموومان ڕۆژانە لە ژێر گوشاری توندو زەبری دیبلۆماسی و سیاسی حکومەتەکانی دەوروبەر بوو، هەمووی تەحەمول دەکرد، بۆ ئەوەی هیچ نەبێ بزووتنەوەکەمان نەخنکێ و بواری هەناسەکێشانی بمێنێت، تا هەلومەرجێکی گونجاوتر، ئەوەی هەمیشە دەگێڕایەوە، ئەو دیلی پێوەندییەکان بوو (هەموومان، هەروەها). ڕسکان لێیان ئاسان نەبوو.

نەماندەتوانی لە هەمان کاتدا لە چەندین بەرەدا بجەنگین، ئەو دەربارەی فیدراڵیزم، نەیگوت بەمن: نەء! بەڵکو گوتی: لەسەرخۆت بەهێمنی بۆی بڕۆ!

دوای ئەوە، کۆمبوونی مەکتەبی سیاسی بەسترا (کە جگە لە سەرۆک حەوت ئەندام بووین بەسکرتێرەوە)، بیروڕاکانم خاڵێکی تایبەتی کۆبوونەوەکە بوو، لەوێدا چەسپاندم، دوای چەند هەفتە کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندی (٢١ ئەندام بووین) هاتە پێش، لەوێ بەگەرمی لە فیدراڵیزم دوام، بەو ڕادەیە گەیشتبووم ئەگەر لێم قبووڵ نەکرێت ڕەنگە لەپارتی بکشێمەوە، بەچارەسەرییەکی مامناوەندی گەیشتین، بەگشتی هەڤاڵانی کۆمیتەی ناوەندی ڕازیبوون کە خاڵێکی تایبەتی لەکۆنووسەکە بنووسرێت کە (فلانەکەس) بڕوای وەهایە مەسەلەی کورد لەعێراقدا لەسەر بنچینەی فیدراڵیزم چارەسەر دەبێت... ئەم (هەڤاڵە) مافی خۆیەتی ئەم بیروڕایەی بۆ خۆی بپارێزێت (بێگومان لە سنووری دیسپلین و پاراستنی ڕیزی پارتیدا).

* ئەمە کەی بوو...

- ئەو بڕگەیە لە سەرەتای کۆنووسی ئەو کۆبوونەوەیە ساڵی ١٩٨٥

هەر وڵاتێکی دەوروبەر (کە گوشارێکی هەمیشەیی بوو) بەر لەهەر کەسێک دەهاتە سەر ئیدریس، چەندین جار بەخۆم شایەدی قورسایی ئەو گوشارانە بوومە. یەکێک لەوانە گوشاری توندی حکومەتی عێراق لە رێگەی حکومەتی ئێرانەوە، هەروەها حکومەتی تورکیا، چونکە دوای کارەساتی ١٩٧٥ هەردوو رژێم (عێراق و ئێران) کۆمیتەی هاوبەشی ئەمنییان دانابوو، تەنیا بۆ چاودێری جموجۆڵی پارتی و پێشمەرگە، نەخاسمە دوای هەڵگیرسانەوەی بەرخۆدانی چەکداری لەگوڵانی ١٩٧٦ەوە، هەردوو رژێم زانیارییان ئاڵوگۆڕ دەکرد. حکومەتی شاهنشایی ئێران، بەئیدریس بارزانی پەیامێکی ئیمزا کردبوو، کە بەرپرسە لە جموجۆڵی گشت پەنابەرەکان (ئەو سەردەمە لە شەست هەزار کەس زیاتر بوون، بەسەرانسەری پارێزگاکانی ئێراندا دابەشکرابوون)، ئەگەر هەر پێشمەرگەیەکی ناو عێراق، هاتوچۆی ناو ئێران بکات، چ بۆ تیمارکردن لە برینداری، یا بۆ هەر هۆیەک، ئەوە (ئێران) یەکسەر ئیدریس دەگرێت و دەیداتەوە دەستی حکومەتی عێراق، خۆی و خێزان و کەسوکار و پەنابەرەکانی دیکەش دەکەونە بەر سزا (تەنانەت رەنگە بەعێراق بدرێنەوە!).

بۆ نموونە جارێک پۆلیسە نهێنییەکانی دەزگای ئەمنییەتی (ساواک)، ساڵی ١٩٧٦، ئابڵۆقەی ماڵی ئیدریسیان دا، ژوور بەژوور پشکنیان، تەنانەت ژووری دایک و ماڵەوەیان... دەگەڕان، گوایە پێشمەرگەیەکی بریندار بدۆزنەوە لەماڵیان، بۆ موعالەجە حەشاردراوە هیچیان نەدۆزییەوە، بەڵام وازیان لێ نەهێنا، لێی کەوتبوونە گومان، دوای ئەوە بۆ چەندین رۆژ بۆ بارەگای سەرەکی (ساواک) لە تاران پەلکێش کرا، جەنەراڵ نەسیری (کە بەدرندەترین بەرپرسی دەوڵەتی شای ئێران دەژمێردرا) بەخۆی خستییە ژێر لێکۆڵینەوەی ئاسایش، بۆ بەندیخانەی (ئەڤین)، کە بەبەدناوی ناسراوبوو ناردبوویان، بۆ تۆقاندن خستبوویانە ژووری ئەشکەنجەو

ژێرزەویی ترسناکەوە، لە ئەمریکاوە لەژێر گوشاری بارزانی تەدەخول کرا، بەشێوەیەکی کاتی وازی لێ بهێنن.

*** ئایا چەند جار کەوتوونەتە ژێر پاڵەپەستۆوە؟**

– ئیدریس چەندین جار کەوتە بەر ئەو پاڵەپەستۆ توندەیە جگە لە پاڵەپەستۆی ڕۆژانە، جارێکیان لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٨دا بوو، کە جارێکی دیکە بانگهێشت کرا بۆ لای جەنەڕاڵ نەسیری، دەیزانی ئەمجارە سەختترە، ترسی هەبوو نەگەڕێتەوە، من و دڵشاد بارزانی بانگ کرد، هەندێ ئامۆژگاری و زانیاری وردی لە لا بوو پێی ڕاگەیاندین، تا ئەگەر نەگەڕایەوە ئێمە چی بکەین، لەبارەی هەندێ کاروبار کە ناتەواو مابوون، بۆ ئەوەش تا هەڤاڵی دیکە تووش نەبن، ئەو زۆر قایم و نهێنی پارێزبوو، زۆریش دەربەستی چارەنووسی هەر هەڤاڵێک بوو، ئەو جارە دیسان بەدەستێوەردانی بارزانی لە ئەمریکا بەسەلامەتی ئازادبوو، دواجار دەرکەوت کە لەم (جەولەیەدا) ئیدریس کەوتبووە بەر گوشارێکی ئێجگار توندو هەڕەشە و گەفی جەنەڕاڵ نەسیری و دەزگای (ساواک) یا (سافاک) کە دەزگایەکی ئەمنی بەناوبانگی ڕژێمی شا بوو. دەیانویست ئیدریس بەهیچ شێوەیەک پشتگیریی شۆڕشی گوڵان و پێشمەرگەی ناو وڵات نەکات، بەڵام لە واقیعدا ئیدریس بەنهێنی سەرکردەو ڕێبەری شۆڕشەکە بوو.

خستنە ژێر گوشارو هەڕەشە جارێک و دوو سێ جار نەبوو، هەر جارێک بەشێوەیەک دووبارە دەبوونەوە. دوای ڕووخانی ڕژێمی شا و سەرکەوتنی کۆماری ئیسلامی، بەچەند هەفتە، ئیدریس بۆ (پادگان/ ئۆردوگایەکی لەشکری) ئێران لە کەرەج بانگ کرا. تەنیا من لەگەڵی بووم، ئاخوند (مەلا)یەکی گەنج بەتەنیا لەپشت مێزێک دانیشتبوو، گوتی: ئێوە بەسێدارە حوکم دراون! ئیدریس گوتی: خێرە؟! ئاخوندەکە گوتی: پەنابەران

بەنهێنی هەڵدێین بۆ عێراق، ئێمە ئاگادار ناکەنەوە، ئێوە بەرپرسن لەو پەنابەرانە، هەر بۆیەش دەبێ ئیعدام بکرێن، (ئەو سەردەمە هەندێ پەنابەر بەدزی دەگەڕانەوە عێراق، هەر یەک لەبەر هۆیەک! بەئیدریسیشیان نەدەگوت، لەسێدارەدانیش ئاسان بوو، لەو باروودۆخەدا دادگایی نەدەویست!)، ئیدریس خۆی تێک نەدا، بەڵام ئاخوندەکە تا دەهات توندتر قسەی دەکرد، هەڕەشەکەی تێکەڵاو بەقسەی ناشیرن دەبوو، ئیدریسیش بەتوندی وەڵامی دەدایەوە، بێ باکی خۆی دەردەبڕی، تا لەناکاودا کابرایەک هات گوتی: ئاغا! لە تەلفۆن تۆیان دەوێ!... ئاخوند چوو ئیتر نەگەڕایەوە، پتر لە نیو سەعات لە ژوورە بچووکەکە بەتەنیا ماینەوە، ئیدریس پەرۆشی منی بوو، دڵی دەدامەوە، تا کەسێکی دیکە بەرگی مەدەنی لەبەردابوو، سەری بەژوورەکەدا کرد و گوتی: ئاغایان! دەتوانن برۆن!، ئێستاشی لەگەڵ بێ ئەو ئاخوندەمان نەبینییەوە، نەمانیش زانی ئەو بەزمە چی بوو. چەندین حاڵەتی وەها ڕووی داوە، تا کۆتایی ژیانی بەردەوام بوو، ئەو هەمیشە بەڵاگێڕبوو، بەر لە هەمووومان و لەجیاتی هەمووومان باجی گرانی خەبات و خۆڕاگرایی دەدا.

(تەواو)



سەردانی سەرۆک بارزانی بۆ بارەگای ئێزگەی دەنگی کوردستان هاوینی ١٩٨٠
لە ڕاستەوە: ئەحمەد بریفکانی، فەلەکەدین کاکەیی، سەرۆک بارزانی، هاشم ئاکرەیی، سەباح بەیتوللا، سەلاح بەرواری، سەدیق، وەلید ئاکرەیی، قادر حەسەن، تەحسین دۆڵەمەری لە دواوە دیارە.



لەڕاستەوە: ملازم عومەر، د.ڕۆژ نوری شاوەیس، فەلەکەدین کاکەیی، کەمال حەسەن چاومار.
ڕاژان ١٩٨١/٣/١٨



فەلەکەدین کاکەیی و خوشکی و خوشکەزای و کچی خۆی ١٩٦٩/٦/١



لە مەکتەبی ناوەندی راگەیاندن لە مەکتەبی سیاسی، راژان هاوینی ١٩٨٠



محیەدین رەحیم، فەلەکەدین کاکەیی
کانوونی دووەم ١٩٨٦ - دیمەشق



لە کۆبوونەوەی بەرەی کوردستانی گوێزێ، پایزی ١٩٨٧



زەعیم عەلی و فەلەکەدین کاکەیی ، ئامادە بوون لە کۆنگرەی بەرەی نیشتمانی دیموکراتی عێراق - گرتک و ڕۆستێ ۱۹۸۲



لە ڕاستەوە: نەجمەدین یوسفی، زەعیم عەلی، فەلەکەدین کاکەیی
لۆلان ۱۹۸۳



ڕاژان - بارەگای مەکتەبی سیاسی پارتی، بەهاری ١٩٨٨
لە ڕاستەوە: دەمیرێر (ڕۆژنامەنووسی تورکی)، فەلەکەدین کاکەیی، مام هەژار، شەهید فرەنسۆ هەریری



ڕاژان - بارەگای مەکتەبی سیاسی پارتی، بەهاری ١٩٨٨
فەلەکەدین کاکەیی، مام هەژار



ماڵی شاعیری عێراقی ناسراو محەمەد مەهدی جەواهری، دیمەشق بەهاری ١٩٨٦
لەڕاستەوە: سەباح مەندەلاوی، خەیال جەواهری، سەرۆک بارزانی ، محەمەد مەهدی جەواهری، فەلەکەدین کاکەیی



ڕێگای خواکورک ئابی ١٩٨٧
لە ڕاستەوە: فەلەکەدین کاکەیی، سامی عەبدولڕەحمان، د.فوئاد مەعسوم



وەرگرتنی خەڵاتی بارزانیساڵی ١٩٩٣ هەولێر
سەرۆک بارزانی مەدالیای بارزانی نەمر بە فەلەکەدین کاکەیی دەبەخشێ



فەلەکەدین کاکەیی، چۆمان - دەربەند، بەهاری ١٩٧٤




دوای بەستنی کۆنگرەی دەیەمی پارتی ١٩٨٩ سەرۆک بارزانی و فەلەکەدین کاکەیی



کۆبوونەوەی سەرکردایەتی بەرەی کوردستانی، دیمەشق تشرینی دووەم ١٩٩٠
لەڕاستەوە: د.مەحمود عوسمان، سامی عەبدولڕەحمان، عەزیز محەمەد،
جەلال تاڵەبانی، فەلەکەدین کاکەیی، فەخری کەریم، ئەبو هیوا، سەید کەریم،
عەدنان موفتی، د.کەمال خۆشناو



دەیەمین کۆنگرەی پارتی، مەلگەوەڕ تشرینی یەکەم ١٩٨٩
لەڕاستەوە: حەمید ئەفەندی، ئازاد قەرەداغی، د. ڕۆژ، مامۆستا عەبدوللا،
سەرۆک بارزانی، فەلەکەدین کاکەیی
ئەوانەی بەرامبەر: هۆشیار زێباری، چەنە هەڤاڵێکی دیکە.



قامشلی - هاوینی ١٩٩٦
لەڕاستەوە: زەعیم عەلی، فەلەکەدین کاکەیی، خزمێکی د.محەمەد ساڵح جمعە،
براگەورەی د.محەمەد ساڵح جمعە، سەرۆک بارزانی ، د.محەمەد ساڵح جمعە.



قاهیره - میسر ٢٧/٩/٢٠٠٠
د.هـ ودا جەمال عەبدولناسر کچی جەمال عەبدولناسر
سەرۆکی عەرەبی ناسراو، فەلەکەدین کاکەیی

ئەمانەتی گشتی
رۆشنبیری و راگەیاندن و لاوان

ناوی تەواوی: فلك الدین صابر کاکەیی
جۆری ئیش: بەڕێوەبەری راگەیاندن
چ ساڵێك لەدایك بوە ولەکوێ: ١٩٤٢ ـ کرکوك
ناو نیشان: (چومـــــان)
ئیمزا

ئەمانەتی گشتی
رۆشنبیری و راگەیاندن و لاوان

ژمارە: ٣٢٤
رۆژی دەرچوونی ناسنامە
ئەمانەتی گشتی
١٠/١٠/١٩٧٤
ئیمزای ئەمینی گشتی

ناسنامەی ئەندامێتی ئەمانەتی گشتی رۆشنبیری و راگەیاندن و لاوان
١٠/١٠/١٩٧٤ چۆمان

بەڕێوەبەرایەتی کاروباری رۆشنبیری و
راگەیاندن و لاوان
ذاتیە / ١
ژمارە / ١٤
رۆژ ـ ٢١/٣/١٩٧٤

ـ بڕیـــــار ـ

لەبەر بەرژەوەندی گشتی
بڕیارماندا بە دانانی کاك فلك الدین کاکەیی بە بەڕێوەبەری راگەیاندن .

دارا توفیــــق
ئەمینی گشتی

وێنەیەك بۆ:
ـ بارەگای بارزانی بەڕێز
ـ م . س / ی بەڕێز
ـ م . ی / ی بەڕێز
ـ دەزگای پاراستن بەڕێز
ـ مەکتەبی تایبەتی بەڕێز
ـ مجلسی تەنفیذی بەڕێز
ـ ئەمانەتی ئەشغال و ئیسکان بەڕێز
ـ ئەمانەتی ناوخۆیی بەڕێز
ـ ئەمانەتی عەدلی بەڕێز
ـ ئیزگەی دەنگی کوردستانی بەڕێز
ـ چاپخانەی مطبعاتی بەڕێز
ـ بەشی تەرجەمەی بەڕێز
ـ بەشی بڵاوکراوە و گوێ گرتن بەڕێز
ـ بەشی بەدواداچوون و لێکۆڵینەوەی بەڕێز
ـ ناوبراو / / بۆ دەست کردن بەکار

بڕیاری دانانی فەلەکەدین کاکەیی بە بەڕێوەبەری ڕاگەیاندن، بە ئیمزای شەهید دارا تەوفیق
١٩٧٤/٣/٢١



فەلەکەدین کاکەیی لە وێنەیەکی دەستکرددا کە کچە
هونەرمەندێکی سوری پێشکەشی کردووە



گەلاڵە ١٩٧٤

